## پێناسەی کتێب

✍ ناوی کتێب: دەربارەی فەلسەفەی پزیشکی.

✍ نووسینی: د.احمد محمود صبحي، د.محمود فهمي زيدان، د. محمود مرسي عبدالله

✍ وەرگێرانی: پ.د. حسن حسین صدیق جەباری.

✍ ژمارەی لاپەڕە : ٢١٧.

✍ ئەندازە: ٨, ١٤ * ٢١ سم.

✍ تیراژ: ٥٠٠.

✍ بابەت: فەلسەفە.

✍ نۆرە و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٢٢ ز.

✍ سەرپەرشتی چاپ:

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٩٤)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە.

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

فەلسەفەی پزیشکی یان هزری پزیشکی وەک هەر بەشێک یان چەمک و زانستێکی تر لە فەلسەفەدا وەک بەشێکی گرنگ جێگای خۆی دەکاتەوە . ئاخێزگەی سەرجەم زانستەکان بۆ بیرکردنەوەی ئاوە زی و بیری فەلسەفە دەگەڕێتەوە، بەتایبەت سەرەتاکانی دەرکەوتنی فەلسەفە. لەتەک ئەوەدا زانستی پزیشکی وەک بەشێکی دانەبڕاوبووە لەناو هزری فەلسەفی، هەر لەگەڵ دەرکەوتنی فەلسەفەدا زانستی پزیشکی وەک کێشەیەکی ئاوەزی و تەندروستی لەناو فەلسەفە و هزری فەیلەسووفاندا هەڵوەستەی لەسەر کراوە. واتە زانستی پزیشکی لەناو هزری فەلسەفیدا لەتەک بابەتەکانی میتافیزیک و لۆژیک و جیۆ-فیزیا و بایۆ-کیمیک و ماتماتیک و ئەستێرەناسی و .....هتد جێگای بایەخی فەیلەسووفان بووە و پێداگری لەسەر کراوە وەک بابەتێکی هەستیار و گرنگی مرۆڤ و بوون.

زانستی پزیشکی وەک بابەتێکی گرنگ لەناو هزری زۆرێک لە فەیلەسووفاندا خۆی وەدەردەخات، تەنانەت لە هزری زۆرێک لە فەیلەسووفانی وەک "هیپۆکراتیس و جالینۆس و سۆکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ......هتد" جێگای بایەخ بووە و خەریکگەرییان کردووە

پەیووەست بەم زانستە، وەک بەشێکی گرنگی فەلسەفە. لەم پێوەدانگەیەوە زانستی پزیشکی لەتەک زانستەکانی تر لەناو هزری فەلسەفی فەیلەسووفاندا وەک زانستی نەخۆشی، یاخود زانستی نەخۆشیناسی، کە تیایدا هۆکار و پۆلێنکاری و چۆنیەتی و چەندێتی و ژینگەی مرۆڤەکان، لەتەک چۆنیەتی چارەسەر ئاماژەی بۆکراوە.

لەگەڵ دەرکەوتنی ژیار و پێشخستنی زانست، فەلسەفە و پزیشکی تا ڕادەیەک، وەک دوو ئەرکی جیاواز لەیەکتر خۆیان پێشخست، واتە هەم لەپیشە و هەم لە ڕووی چۆنیەتی بابەتە پراکتیکیەکان، تەنها لە ڕووی تیۆرییەوە زانستی پزیشکی وەک لقێک لە هزری فەلسەفیدا خۆی هێشتەوە. لەم پێوەدانگەیەوە دەتوانین ئاماژە بە هزری "فۆکۆ" بکەین، کە زانستی پزیشکی وەک زانستێکی تاک دەناسێنێ. خستنەڕوو و گەشەسەندنی زانستی پزیشکی وەک چارەسەر لەناو هزری فەلسەفیدا، پەلکێشکردنی مرۆڤ بووە لە خورافیاتەوە بەرەو دۆزینەوە و ڕزگارکردن و خۆناسی مرۆڤەکان، لەتەک دەرخستنی توانای مرۆڤەکان لەناو گەردووندا، هەر لەم چوارچێوەیەشدا چەندین پرسیار و بابەتی ئەخلاقی و یاسایی بۆ ئەم زانستە خراوەتەڕوو، کە پزیشک کێیە؟ نەخۆش کێیە؟

چارەسەرکرن چۆنە و چیە؟ پاپەندبوونی پزیشک لەڕووی مۆڕاڵی و ناسینی نەخۆش و چۆنیەتی مامەڵکردنی پزیشک لەگەڵ نەخۆش و ...هتد جێگای بایەخ بووە و هەڵوەستەی لەسەر کراوە.

گرنگی وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین بابەتی هەستیار، کە هەم خزمەتێک بە کتێبخانەی کوردی بکرێت و هەم تاکی کورد ئاشنابکرێت بە چۆنیەتی پەیوەندی نێوان فەلسەفە و پزیشکی وەک دوو بابەتی لێکدانەبڕاو، یاخود چۆنیەتی زانستی پزیشکی وەک بەشێکی گرنگ و هەڵوەستە لەسەرکراوی هزری فەلسەفی و خەریککەری فەیلەسووفان پەیوەست بەم بابەتەوە. لەم پێوەدانگەیەوە تیایدا گوزارشت لە هزری فەلسەفی کراوە پەیوەندیدار بە زانستی پزیشکی بەگوێرەی سەردەم و پێشخستنی زانستی مرۆڤایەتی و دەرکەوتنی شارستانییەتەکان. لەتەک ئەوەشدا تیایدا هەڵسەنگاندن کراوە پەیوەست بە زانستی پزیشکی لە یۆنانی کۆندا بەرەو زانستی پزیشکی سەردەمی ئیسلامی و سەردەمی مۆدێرن، هەروەها چارەسەری دەروونی و ڕۆڵ و کاریگەریەکانی سۆفیزم لەمەڕ زانستی پزیشکی و چۆنیەتی خستنەڕووی بابەت و میتۆدەکانیان لە چوارچێوەی زانستی پزیشکیدا.

یەکێک لە بابەتە هەستیارەکانی ئەم پەرتووکە، وروژاندنی ئاکار" ئەخلاق"ی پزیشکیە، کە لەناو چێوەی هزری فەلسەفیدا دەرچوونی بۆ نییە، واتە ئاکاری پزیشکی وەک بابەتی ئاکارناسی لەبەرامبەر نەخۆش و ناساندنی جۆری نەخۆش و چۆنیەتی دەستنیشانکردن و چارەسەر و مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشدا بابەتێکی هەستیار و کاریگەری هزری فەلسەفیە، کە تیایدا فەیلەسووفان لەتەک بابەتەکانی ئەقڵ و سروستی ئەقڵی مرۆیی هەڵوەستەیان لەسەر کردووە. هەروەها وروژاندنی بابەتی وەچەخستنەوە و پاساوەکانی مراندن بەشێوەی ئەنقەست، یان مراندنی بە بەزەییانە تیایدا وەک بابەتێکی هەستیاری زانستی پزیشکی و پەیوەندیدار بە هزری فەلسەفی و تێڕوانینی کۆن و نوێی فەیلەسووفان هەڵوەستەی لەسەر کراوە.



# بەشی یەکەم

## هزری فەلسەفی پەیوەست بە زانستی پزیشکی

هزری فەلسەفی و فەلسەفە، کە دایکی سەرجەم زانستەکانە، ڕوودەکاتە سەرجەم ئەو لایەنانەی، کە پەیوەستن بە ژیانی مرۆڤەوە، لەتەک وروژاندنی بابەتە ئەرێنی و نەرێنیەکان هەڵوەستەی لەسەر تەواوی بنەما زانستیەکان کردووەتەوە. بواری پزیشکی کە خۆی لە دۆزینەوە و داهێنانەکانی هزری مرۆڤدا دەبینێتەوە، هەڵبەت وەک لقێک لە دیرۆکی زانستی لەلایەن مرۆڤەوە جێگای بایەخ بووە، لەم پێوەدانگەیەوە مرۆڤ بۆ مانەوەی خۆی خەریکگەری تەواوی تێدا کردووە و لە ئەنجامی بەردەوامی هزرینەکانی لەم بوارەدا توانیویەتی لە ڕووی زانستییەوە پێشکەوتنەکانی خۆی پێشبخات. لەسەردەمی مۆدێرنەدا کە مرۆڤ تێیدا لەتەک چارەسەرە پزیشکیەکان ڕووبەڕووی چەندین پرسیار دەبێتەوە و هۆشی خۆی تێدا وەگەڕدەخات، بۆ گەیشتن بە چارەسەری و دۆزینەوەی میتۆدێک بۆ خۆدەربازکردن لەو دۆخەی کە دێتە بەردەمی و هەڕەشە لە خۆی و سەرجەم مرۆڤایەتی دەکات. لەم پێوەدانگەیەوە هزری فەلسەفی

یاخود فەلسەفەی پزیشکی، وەک لقێک لە خەریکئەگەریەکانی فەلسەفە ئەگەرەکە هەڵوەستەی لەسەربکرێ.

بۆ سیستەمی پزیشکی دوو بنەمای فەلسەفی گرنگ هەن، ئەوانیش بنەمای "ڕێبازی زیندووێتی" لە بەرامبەر بنەمای "ڕێبازی مادی". لێرەدا بە کورتی ئاماژە بە دەستەواژە بنەڕەتیەکانی ڕێبازی زیندووێتی دەکەین بەم جۆرەی خوارەوە:

**یەکەم:** جیاوازی نێوان بوونەوەری ئەندامی لەگەڵ بوونەوەری نائەندامی جیاوازیەکەیان لە پلەدایە نەک لە سروشتدا، بۆیە ناکرێ ئێمە ژیان بۆ توخمی نازیندوو "بێگیان" بگەڕێنینەوە، بە جیاوازی لەگەڵ ئەوەی زانستی نوێ دەیکات لە گەڕانەوەی دیاردە بیۆلۆجیەکان بۆ فاکتەرە فیزیکی و کیمیاییەکان.

**دووەم:** تیۆری تاکێتی گشتی، دەڕوانێتە مرۆڤ وەک یەکەیەک یان ستراکچەرێکی تەواوکاری.

لیۆن لیدرەمان کە فیزیائەگەرێکی ئەمریکیە، لە کتێبی "فەلسەفە و پزیشکی" باس لەوە دەکات کە دوو جۆر لە فەلسەفە جێگای هەڵوەستە لەسەرکردنە بۆ فەلسەفەی پزیشکی ئەوانیش:

***یەکەم: فەلسەفەی مادی.**

***دووەم: فەلسەفەی ڕێبازی گشتی، کە تێیدا چەند خەسڵەتێک لەخۆدەگرێ، ئەوانیش:**

**خەسڵەتی یەکەم:** دەڕوانێتە مرۆڤ وەک یەکەیەکی تەواوکاری، ئەگەر ئەندامێکی نەخۆش کەوێت ئەوە سەرجەم ئەنداماکانی تری نەخۆش دەبن و ئازار دەکێشن.

**خەسڵەتی دووەم:** ئەم جۆرە تەنها پەیووەست بە بەشە پێکهێنەرەکان نییە، بەڵکو لەوە زیاترە، چونکە یەکبوونی ئەندامێتی نێوان بەشەکان هەندێ تایبەتمەندی دروستدەکات کە لە بەشەکاندا نییە، بەنمونە ئەگەر هەموو ئەندامێکی باڵندەیەک توانای فڕینی نەبێت، ئەوە باڵندەکە وەک یەکەیەکی گشتی دەفڕێت، بەپێچەوانەی مادەی بێگیان کە هەموو بەشێکی سەرجەم سیفەتەکانی تر لەخۆدەگرێ.

**خەسڵەتی سێیەم:** ئەم جۆرە لە خەسڵەتی گشتی ئەرک و فەرمانی بەشەکانیتر دیاریدەکات، چونکە ئەندامەکان بە تەنها توانای کارکردنیان نیە، بەنمونە "چاو" ئەگەر لە بەشەکانی تری جیابکەیتەوە توانای بینینی نامینێت.

**خەسڵەتی چوارەم:** لێرەدا ناتواندرێت ئەوەی بەرزە بیگەڕێنینەوە بۆ نزم، تایبەتمەندی ژیان بۆ سیفاتی بێگیان ناگەڕێتەوە، هەروەها دیاردە بیۆلۆجیەکان بە هۆکارە فیزیکی و کیمیایەکان ڕاڤە و ڕوون ناکرێتەوە.

لەئەنجامی ورروژاندنی ئەو خاڵانەی سەرەوە دەگەین بەم جیاوازییە، کە زاراوەکانی ڕێبازی زیندووێتی بریتیین لە "گشتی - تاکیتی - ئەندامیتی - تەواوکاری"، بەڵام زاراوەکانی ڕێبازی مادی بریتیین لە "میکانیکی - فرەیی- توخمەکان". لەم پێوەدانگەیەوە پێویستە ئاماژە بە هەندێ تێبینی بکەین، پێش ئەوەی باس لە نمونەکانی ئەو ڕێبازانە بکەین:

١- زۆر جار باس لەوە دەکرێ، کە ئەرستۆ دانەری ڕێبازی زیندووێتی وەک ئەوەی "مورتون بخنەر" لە فەرهەنگی فەلسەفی ئاماژەی بۆ کردووە، دوای ئەوەی ڕەخنەکانی خۆی ئاڕاستەی ڕێبازی مادی دیموکریتس کرد.

٢- ئاراستەی گشتی تەنها تایبەت نییە بە ڕێبازی زیندوویتی، بەڵکو ئاسۆی زیاتر لەخۆدەگرێ لە بوارەکانی هزر و زانست، بە نمونە لە فەلسەفەی هیگڵ یەکێکە لە سیما گرنگەکانی فەلسەفەکەی، کە تیایدا ویست و ئازادی دەوڵەت دەکەوێتە سەروی ویست و ئازادی کۆمەڵانی تاک و خەڵک. هەروەها لە تیۆری سایکۆلۆجیای جیشتاڵەت باس لەوە دەکات ئێمە دەرک بە بوونەوەری زیندوو دەکەین پێش ئەوەی دەرک بە بەشەکانی بکرێ. بگرە ئەم تێڕوانینە گشتییە پەل دەهاوێژێ بۆ نێو ئایین، بە نمونە "سەرجەم نەوەی ئادەم هەڵەکارن"، هەروەها "سەرجەمی گەلەکەم لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە"، وەک دەبینین سەرجەمی تاکەکان بەوە وەسفکران ڕەنگە هەڵەبکەن و کۆمەڵیشی بەوە وەسفکرد کە تاوان نەکەن یان لەسەر تاوان کۆنەبنەوە، ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی کە گشت تەنها کۆی تاکەکانی نییە.

بۆیە دەبینین هەمان ئەم فەلسەفەیە لە کۆندا لە بواری پزیشکیدا، تێگەیشتنی بۆ نەخۆشی و شێوازی چارەسەرکردنی دیاریکردووە، بەوەی نەخۆشییەکە تەنها یەک ئەندامی کەسەکە نییە بەڵکو کۆی تاک نەخوشە، بۆیە بۆ چاکبوونەوە و چارەسەر ئەگەرەکە کۆی تاکەکە بگەڕێتەوە سەر

تەندروستی جارانی، ئەمەش بە گەڕانەوەی توانا و ئەرکە بۆ سەرجەم ئەندامەکانی تری لاشە. هەروەها شێوازی چارەسەریشی دیاریکردووە بەوەی کە چارەسەر بە خۆراک لە دەرمان باشترە، وەک چۆن چارەسەری سروشتی لە چارەسەری نەشتەرگەری باشترە. لێرەوە دەبینین کە پزیشکی بەریتانی "ج.ر.ورسلی" لە کتێبی "ڕێنیشاندەر بەرەو دەرزی چینی"، پزیشکی ڕۆژئاوایی کار لەسەر ئەوە دەکات قەرەبووی ئەوە دەکاتەوە، کە نەخۆشەکە لەدەستیداوە، بەڵام پزیشکی چینی بەمە ڕاناوەستێت، چونکە جەستە بەم جۆرە چالاکی خۆی بەدەست ناهێنیتەوە، بۆیە بە دەرزی چینی چارەسەری بۆ و کار بۆ گەڕانەوەی جەستە وەک یەکەیەکی گشتی بۆ ئەرک و کارەکانی دەکات ، چونکە چارەسەری گشت پێش چارەسەری بەش دەکەوێت. ئەمە بە هۆی بوونی فەلسەفەی تایبەتەوە بووە کە بەو جۆرە باس لە چارەسەری نەخۆشی بکرێ، واتای ئەوە نییە کە پزیشکی لەو قۆناغەدا دواکەوتوو بووە یان پسپۆری نەبووە، نەبوونی پسپۆری بۆ ئەو تێڕاونینە فەلسەفییە دەگەڕێتەوە کە ئاماژەمان بۆ کرد.

بۆیە دەبینین کە "سورانديک" لە کتێبی قۆناغی گواستنەوەی سیستەمی پزیشکی لە کۆنەوە بۆ نوێ لە سەدەی ١٤ و ١٥ لە ڕۆژئاوا، ئاماژە بەوە

دەکات کە پسپۆڕێتی پزیشکی لە نەخۆشیەکدا وەک "چاو - لوت...هتد" بە کارێکی لادەر و نەشاز وەسفکردووە، چونکە تێڕوانینە پزیشکییەکەی ئەو سەردەمە ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە بوونەوەری زیندوو وەک کۆمەڵە بەشێک تەماشا بکرێ.

لە تیۆری گشتیەوە چەند بنەمایەک دەردەکەون ئەوانیش:

**بنەمای یەکەم:** "هاوسەنگی" بۆ دروستبوونی هاوسەنگی نێوان ئەندامەکان لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیان.

**بنەمای دووەم:** "مەبەستگەرایی" بۆ ئەوەی هەموو ئەندامێک ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

**بنەمای سێهەم:** دەبێ شێوازی زانینی و دەستنیشانکردنەکە گونجاوبێت لەگەڵ تیۆرە گشتیەکە.

## بنەمای یەکەم: هاوسەنگی

پەیوەندی نێوان فەلسەفە و پزیشکی لە بنەمای هاوسەنگیدا جێگیر دەبێ، لە ڕوانگە فەلسەفیەکەوە، بریتییە لە تێگەیشتن لە لایەنەکانی هزری

یۆنانی لەژێر ڕۆشنایی فەلسەفەی ئەمبادوکلیتس، گونجاندنی نێوان چوار توخمەکە "ئاگر- ئاو – گڵ – هەوا". هەروەها لە هاوسەنگی نێوان هەرسێ هێزەکەی دەروون بۆ ئەوەی دادگەری بەدیبێت. هاوسەنگیە لەنێوان هەرسێ چینەکانی کۆمەڵگا "فەرمانڕەواکان – سەربازەکان – وەرزێرەکان" لە کۆماری پلاتۆندا. لەم پێوەدانگەیەوە هاوسەنگی ناوەندی ئاڵتونی ئەرستۆ بۆ گەیشتن بە فەزیلەت(چاکە)، کاریگەری هەبووە لەسەر پزیشکی لە یۆنانی کۆندا. لەتەک ئەوەشدا ژیان و تەندروستی هێمای گونجاندنە لای فیساگۆرسەکان، واتە نەخۆشی لەدەستدانی گونجاندنەکەیە، ئەرکی پزیشک لیرەدا گەڕانەوەی گونجاندنەکەیە بۆ دۆخی جارانی. بەنمونە گەڕانەوەی هاوسەنگی لەنێوان گەرمی لەش و ساردی هەوای دەرەوە، هەروەها تەندروستی لای ئەمبادۆکلیس بریتییە لە هاوسەنگی لەنێوان هەرچوار توخمەکە بە هۆی فاکتەری خۆشەویستیەوە، هەر وەک چۆن نەخۆشی لەدەستدانی هاوسەنگیە بەهۆی فاکتەری ڕقلێبوونەوە لەنێوان "گەرمی – ساردی – شێ – شکی"، بۆیە کاری پزیشک لە ڕوانگەی " ئەبوقرات"ی یۆنانی ناسراوە بە باوکی پزیشکی و سوێندی پزیشکی. لە دیدی ئەبوقرات چارەسەری گەڕانەوەی تەوازنە

نەک بە دەرمان بەڵکو بە پێدانی پشوو و ئارامی بە دەروون و جەستە، هەروەها تەوازن لەنێوان هەرچوار میزاجەکە. لای جالینوس بریتییە لە کاری پزیشکی.

بۆ چارەسەری چینی دەبینین، کە بناغەی تیۆری ئەم چارەسەرە، بریتییە لە زانین بە بوونی تێکچوون لە وزەی زیندوویێتی، کە لە ناو جەستەدایە، بەوەی کە گەڕانەوەی ئەم هاوسەنگیە بۆ هاتووچۆنی وزەکە لەناو جەستەدا چالاکی و زیندوویێتی و چارەسەر بە نەخۆشەکە دەبەخشێت. هەمان ئەم بیرۆکەیە لە پزیشکی چینیدا بۆ بوونی بیرۆکەیەکی فەلسەفی دەگەڕێتەوە ئەویش "ڕێکی لە ڕیتمی نێوان دوو هێزی دژ بەیەک" " یانگ - یەن" " ئەرێنی - نەرێنی"، لەژێر ڕۆشنایی ئەم دوو هێزەدا سەرجەم دیاردە سروشتی و گەردوونی و ژیانیەکان ڕاڤە دەکران، وەک چۆن مێژوونوس " ئارنۆڵد توینبی" لەم بۆچوونەی باشتر نەبینی بۆ ڕاڤەکردنی ڕووداوە مێژووییەکان لەڕێگەی تیۆری " ئاڵنگاری و وەڵامدانەوە".

وزەی ناو جەستە بە ڕیتمێکی ڕێکو پێک بەناو جەستەدا بە ڕێگای ڕێڕەو و کەناڵەکانەوە " تشنج لو" دێت و دەڕوات، ئەگەر هێزی (یانج)

باڵادەست بێت ئەوە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی گەرمی لەش و ئازاری بەتین، بەڵام ئەگەر هێزی (یەن) باڵادەست بێت ئەوە جەستە توشی داڕمان و داخوران دەبێت، بۆیە دەرزی ئاژنین کار بۆ گەڕانەوەی هاوسەنگی نێوان ئەو دوو هێزە دەکات، بەنمونە ڕشتنی ترشەڵۆکی ناو گەدە بەهۆی برینی گەدەوە، کە بریتییە لە زیادبوون لە هێزی یانگ، بۆیە بەکارهێنانی دەرزی ئاژنین لەسەر چەند خاڵێکی دیاریکراو دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو وزەیە، کە بووەتە هۆی زیادبوونی ڕشتنی ترشەڵۆکەک، بەڵام لە پزیشکی نوێدا دەبینین پزیشکەکە تەنها گرنگی بەو بەشە دەدات کە تووشی نەخۆشیەکە بووە نەک هەموو جەستە، هەندێ هۆکار و فاکتەر جیادەکاتەوە کە پێیوایە کاریگەری لەسەر دیاردەکە هەیە.

**بنەمای دووەم: مەبەستگەرایی**

بنەمای مەبەستگەرایی بە شێوەیەکی تۆکمە پەیوەندی بە ڕێبازی زیندوێتی و ئاڕاستەی گشتگەرایی هەیە ، لە دیدی فەلسەفیەوە مەبەستگەرایی کرۆکی فەلسەفەی ئەرستۆ پێکدەهێنیت، چونکە پێشەکی گەورە لای ئەرستۆ بریتییە لەوەی "گەردوونێک مەبەستگەرایی فەرمانڕەوایی دەکات" لۆجیکی ترە لەوەی بڵێین "گەردوونێک ڕێکەوت

بەڕێوەی دەبات". بۆیە مەبەستگەرایی لە بوون و سروشتدا جێگیرە، لە بوونەوەرە و ڕووەک و زیندەوەر و مرۆڤەکان، کامڵبوونی هەریەک لەوانە لە بەدیهێنانی مەبەستەکەیەوە بەدەستدێت "واتا مەبەست لە هەبوونی چیە".

لە دیدی پزیشکیەوە: تەندروستی تەواو و کامڵ لە جێبەجێکردنی ئەندامەکانەوەیە لە ئەرکەکانیدا، کەواتە بنەماکە لە فەلسەفە و پزیشکی یەکن، ئەویش "مەبەستگەراییە" لە بوون و ئەرک.

مەبەستگەرا تەنها لەوە کورت نابێتەوە کە دەڵێت: "هەموو ئەندامێک ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات" ئەمە زانراوە، وەک ئەوەی دەوترێ مەبەست لە دڵ هێنان و بردنی خوێنە لە دەمارەکانەوە، یان مەبەست لە سییەکان پێدانی ئۆکسجینە بە جەستە و ڕزگاربوونە لە دووانە ئۆکسیدی کاربۆن، بەڵکو ئەمە بە هۆی یاسایەک ڕوودەدات، کە لە هزری یۆنانیدا ناوی لێنراوە "سروشت" وە لە هزری چینیدا ناولینراوە بە "وزەی زیندوێتی".

لێرەدا ئەرستۆ پێناسەی سروشت دەکات و دەڵێت: "بریتییە لە بنەمای جوڵە و ڕاوەستان لە بوونەوەرە سروشتیەکان، وەک جیاوازیەک لەگەڵ بوونەوەر دەستکردەکان. بۆیە بەکارهێنانی وشەی "سروشت" بۆ شتێکی ناوخۆی بوونەوەرێکی ئەندامی دەگەڕێتەوە، چونکە ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان مرۆڤ و جیهانی دەرەوە، واتە وەک دوو دیوی یەک دراون بۆ "گەردوون". ئەگەر لە دیوێکییەوە تەماشای بکەی، ئەوە مرۆڤە یان جیهانی بچووک، ئەگەر لە دیوەکەی ترەوە تەماشای بکەی ئەوە جیهانی گەورەیە، لێرەدا ئەبوو حەیانی تەوحیدی دەڵێت: (ئەگەر مرۆڤی ناسی ئەوە جیهانی بچووکی ناسیوە، ئەگەر جیهانی ناسی ئەوە مرۆڤی گەورەی ناسیوە). هەمان ئەم بۆچوونە ڕەنگدانەوەی لەسەر کاری پزیشکی هەبووە ، بەوەی سروشت دۆخێکی نەرێنی نییە، بەڵکو بەئاگایانە کاری خۆی دەکات لە ململانێی لەگەڵ نەخۆشیەکان، لەتەک ئەوەشدا پەنا بۆ ئەو دەرمانە دەبات کە بۆ ئەندامە نەخۆشەکە گونجاوە، بەوەی ئەگەر هاتوو دەرمانەکە لەلایەن ئەندامەکەوە هەستپێکرا، ئەوە سروشتەکەی بەلای خویدا ڕایدەکێشیت بەپێی بنەمای فەلسەفی کە دەڵێت : "هاوشێوە هاوشێوەی خۆی ڕادەکێشێت" و هانا بۆ ئەو هێزە دەبات، کە بۆ سروشتی

دەرمانەکە دیاریکراوە و پاڵ بە درمەکەوە دەنێت و ڕزگاری دەکات. بەهەمان شێوە وزەی زیندووێتی لە چارەسەری چینیدا ڕۆڵی ئەو سروشتە دەبینێت، کە لە هزری یۆنانی ئاماژەی پێکراوە، بە نمونە:

١-چارەسەری ڕۆژئاوایی کار لەسەر ئەوە دەکات، نەخۆشەکە قەرەبووو کاتەوە لەوەی توشی بووە "بە ئاسن لە کاتی ئەنیما - بە ئەنسۆلین لەکاتی شەکرە - کالیسیۆم لەکاتی نەخوشیەکانی ئیسک". مەرج نیە جەستە گەڕایەوە دۆخی جارانی خۆی و ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات، لە کاتێکدا دەبینین چارەسەری چینی بە دەرزی ئاژنین کار بۆ ئەوە دەکات جەستە خۆی ئەو کەرەستانە دروستکاتەوە کە لەدەستیداوە.

٢-شکان و لێکترازانی ئێسک: پزیشکی ڕۆژئاوایی پەنا دەبات بۆ بەیەکگەیاندنی ئێسکەکان لە ڕێگای بەستن و گەچەوە، بەڵام لە ڕێبازی زیندوێتیدا وزەی زیندوو وریا دەکرێتەوە، بە چارەسەری چینی، دوای ئەوە ئێسکەکان خۆیان بۆ دۆخی جارانیان دەگەڕێنەوە وەک چۆن گوڵی گوڵەبەڕۆژە بۆ سەرچاوەی ڕووناکی ژیانی دەگەڕێتەوە و دەکرێتەوە، بەو جۆرە ئێسکەکان کاردەکەن بۆ دووبارە چاکبوونەوە.

**لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دوو تێبینی بدەم ئەوانیش:**

**یەکەم:** بنەمای مەبەستگەرایی ناکەوێتە ژێر تاقیکردنەوەی ئەزمونیەوە، بەڵام مەرج نیە ڕەتبکرێتەوە وەک چۆن " کانت" ئاماژەی بۆ کردووە، چونکە ناتوانین تەماشای سروشتی ناوەوە یان وزەی زیندوێتی بوونەوەران بکەین، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە بوونی نییە.

**دووەم:** لەبەرئەوەی شیاو بووە ئامڕاز جۆراجۆر هەبن بە گەیشتن بە مەبەستەکە "هەموو ڕێگاکان دەچنەوە ڕۆما"، ئەوە شێواز و ئامڕاز جۆراجۆر لە چارەسەرکردنی پزیشکی کۆندا هانای بۆ براوە وەک جادو و دوعا و گیای سروشتی...هتد، بەڵام لە پزیشکی نوێدا بە هیچ شێوەیەک ڕێگە نەدراوە چارەسەریتر بەشداربێت لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان، چونکە زانست جیاوازە لە سیحر و جادو و دوعاکردن، ئەمانە ناکەونە ژێر تاقیکردنەوەی ئەزموونیەوە.

لەگەڵ ڕازیبوون بەوەی زۆربەی چارەسەرەکان لە دەرەوەی جیهانی بینین، "جیهانی غەیب"، هێشتا ڕۆڵی هەبووە لە وروژاندنی وزەکانی ناو جەستەی نەخۆشەکە بۆ چارەسەری درمەکە، تۆ نەخۆشەکە لە ڕێگای

نوشتەوە دەخەیتە دۆخێکی دەروونیەوە بۆئەوەی هێزە ناخەکیەکانی خۆی چالاک کات بۆ چارەسەری نەخوشیەکە وەک ئەوەی لە میسری کۆن دەکرا "سیجریست- دەربارەی پزیشکی لە میسری کۆن".

لە یۆنانی کۆن خواوەندی "ئەسکلیبیوس" وەک جێگرەوەی خواەند "ئەمنحوتب" لای میسریەکان، کرا بە خواوەندی چارەسەر بۆ نەخۆشیەکان، ئەمە لایەنی سایکۆلۆجی تاک نیشاندەدات کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری هێزی دەرکی لە ژیاندا. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پزیشکی لە جیهانی کۆندا بە ئاگا بووە لەوەی مرۆڤ و روحی نەخۆشەکە کاریگەری لە چارەسەرکردنی درمەکان هەیە ، بەڵام پزیشکی نوێ ئەمەی پشتگوێ خست.

سێیەم: تایبەت بە میتۆدی زانین، بریتییە لە "چاوناسی" "فراسە": لێرەدا زانای دەروونناس سوراندیک دەڵێت: "پەسەندکردنی تیۆری جیشتاڵەت دەبێتە هۆی متمانەپێکردن بە زانستی سەرناسی"، بەڵام لەگەڵ نەمانی تیۆری گشتگەرا تیۆری سەرناسیش دیارنەما، لە دوای دەرکەوتنی توێژینەوەی شیکارییەوە قوربانی درا بە گشتی لەسەر حیسابی بەش.

**پێناسەکردنی سەرناسی:** ناسینەوەی ڕووی ناوەوەی بوونەوەرە لە ڕێگای دیوی دەرەوەی بوونەوەرکە، واتا ئاماژەکردنە بە ناوەوەی شتەکە لە ڕێگای دەرەوەی شتەکە.

دەبینین ئیبن سینا لە پۆلێنکردنی بۆ زانستەکان جیاوازی لە نێوان دوو بەش دەکات ئەوانیش "ڕەسەن " و " لق"، لەبەشە ڕەسەنەکەی زانستی سروشتی پزیشکی و سەرناسی وەک لقێک لێی دەبێتەوە، ئەمە بۆ خۆی ئاماژەیە بۆ بوونی پەیووەندیەکی بەهێز لەنێوانیان، بەڵام فەخرەدینی ڕازی پێیوایە سەرناسی بەشێکە لە زانستی سروشتی و هیچی کەمتر نیە لە پزیشکی.

لێرەوە جۆن ولسن دەربارەی مەدەنیەتی میسری کۆن دەڵێت: میتۆدی زانینی دەستنیشانکردنی نەخۆشی و دیاریکردنی شێوازی چارەسەرکەیان پشتی بە حەدەس دەبەست، کە لەگەڵ تێڕوانینی گشتگەرا دەگونجا. بەڵکو سەرناسی لە پزیشکی چینیدا گەیشتە سنورێک کە تەنها پشتی بە بینین و تەماشاکردن نەدەبەست، پزیشکی لیهاتوو و بە ئەزموون تەنها بە

چوونە ژورەوەی ژووری نەخۆشەکە و بۆنکردنی بۆنی ناو ژوورەکە دەیزانی کەسەکە تای هەیە و پلەی گەرمی بەرزە.

لێرەدا حاجی خەلیفە باس لەوە دەکات، کە پەرتوکی ڕازی لە سەرناسی لە پەرتووکی ئەرستۆ "نهێنی نهێنیەکان" وەرگیراوە، ئەمە واتای ئەوەیە سەرناسی لە کلتوری یۆنانەوە بۆ موسڵمانان گواستراوەتەوە. بۆیە سەرناسی تەنها بە ئەزموون و شارەزایی گەشە ناکات، بەڵکو پێویستی بە بەسیرە هەبووە لەلایەن ئەو کەسانەی ئامادەیان هەبووە سەرناس بن، وەک چۆن وەرگرتنی زانیاری بەبێ زیرەکی بەتەنها ڕێ بۆ خوێندکار خۆش ناکات تا سەرکەوتووبێ، بۆیە هەرچەندە دەروون ساف و بێ ئەگەرد بێت ئەوەندە توانای سەرناسینی هەیە، بەڵام ئەوە خەم وخەفەتە ڕێگری لێدەکات، بۆیە پێویست بووو سەرەتا دەروون لەسەرجەم ئەوانە پاک بکرێتەوە، بۆئەوەی ئامادەبێت بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەکان و ڕونکردنەوەی هێماکان.

سەرناسی بەهەمان شێوەی مەبەستگەرایی ناچێتە ژێرباری تاقیکردنەوەی ئەزموونیەوە، بۆیە لە ڕوانگەی پزیشکی نوێوە ڕووبەڕووی

ڕەخنە و ڕەتکردنەوە بووەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا زانایان لە کۆندا دەرکیان بەوە کردبووو کە سەرناسی لە بڕیاردان پەلە پەلی پێوە دیارە، هەر بۆیە ئیبن ڕوشد، وەک زانینی مەزەندەیی وەسفی کردووە، چونکە پەیوەندی نێوان هێما و هێمابۆکراو ڕوون نییە. لێرەدا زانستی پزیشکی نوێ سەرناسی ڕەتدەکاتەوە، چونکە پێچەوانەوەی شیکردنەوەیە، شیکردنەوەش بنەمایەکی گرنگی پزیشکیە، بۆیە کلود برنار دەڵێت: "پێویستە دژی بیرۆکەی "هەستی پزیشکی" ببینەوە، بەوەی کە پزیشک بەهۆی سوسە وە یان ئیلهامەوە سەرکەوتوو دەبێ، ئەمە بەو جۆرە ڕوونادات تا ئەوکاتەی پزیشکی دەبێتە زانستی، هیچ لوژیکی نیە پزیشک زانا نەبێت، ئەوانەی بانگەشە بۆ "هەستی پزیشکی" دەکەن دژی پەرەسەندنی پزیشکین، چونکە زیادەڕەوی لە بەرزڕاگرتنی کەسایەتی پزیشک دەکەن و لە بەهای زانست کەم دەکەنەوە.

دەربڕینی ئەوەی پزیشکی ئیلهامە هیچ نییە جگە لە وەهم، بە ناوی زانستەوە پێویستە ئەو ئیلهامە دوربخرێتەوە، ئەوانەی دەڵێن پزیشکی ڕاهینانە باس لە دوو پڕوپاگەندە دەکەن ئەوانیش:

١-پزیشکی زانا زیاتر شەرمنە لە پزیشکی راهینە راو لە بەردەم نەخۆشدا.

٢- پزیشکی سەرکەوتوو بە ژمارەی ئەو نەخۆشانە پێوانە دەکرێ کە چارەسەری کردوون.

بۆ وەڵامدانەوەی بۆچوونی یەکەم: زانستخوازی وا لە پزیشک دەخوازێت بێ هەبوونی زانیاری ورد بەسەرجەم لایەنە خراپیەکانی دەرمانەکان کاری پزیشکی خۆی ناکات.

هەروەها بۆ وەڵامی بۆچوونی دووەم: سەرەتا پێویستە لە ڕووی زانستیەوە بسەلمێنرێت کە ئەو هەموویانی چارەسەر کردووە، چونکە هیچ بەڵگەیەک نیە لەسەر ڕاستی ئەو بانگەشەیە " ئیلهامی چارەسەرکردن"، تەنها چەند ڕووداویکی کەم نەبێت کە نەزان و قۆڵبڕەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

بە کورتی پزیشکی ئەزموونی بێ بڵاوبوونەوەی روحی زانستی گەشە ناکات. پێویستە پزیشکی لەسەر هەمان بنەما بێت کە زانستی ئەزموونی لەسەرێتی. گومان لەوەدا نییە پزیشکی دەستبەرداری شیکردنەوە نابێت، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی حەدەسی پزیشکی ڕەتکرێتەوە، بەوەی

سەرکەوتنی پزیشک بە ژمارەی چارەسەرکراوەکانی دەپێورێت پڕوپاگەندە بێت لەلایەن پزیشکی مومارسەوە نەک پزیشکی زانا، بەڵکو ئەوە بڕیاری نەخۆشەکان کە لەگەڵیان کاریان کردووە، چونکە مەبەستەکە گەڕانەوەی تەندروستیە بۆ نەخۆشەکان جا ئەو کەسەی چارەسەرەکە دەکات پزیشکی زانا بێت یان مومارس نمونە "مەلا عەلی کەڵک". بۆیە دەبینین کە بەرگری "هنری برجسون" لە "حەدەس" وەک کاردانەوە وایە بەرامبەر بە میتۆدی شیکاری کە لەگەڵ گەشەکردنی زانستە ئەزموونیەکان و ڕێبازی مادییەوە پشتیوانی لێکرا. بەوەی بوونەوەری زیندوو "مەکینەیەکی زیندووە"، هەموو ئەو یاسایانەی لەسەر جێبەجێ دەبێ کە لەسەر بابەتە نا ئەندامیەکان جێبەجێ دەبێ.

**بەرگری هنری برجسون لە سوسە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە کورت دەکرینەوە:**

١-حەدەس تێڕاونینێکی ناخەکیە بۆ ژیان و دەرک بە هەڵقوڵان و بەردەوامی دەکات، بەڵام شیکردنەوە تەنها سودی بۆ لایەنی دەرەوەی بابەتەکە هەیە و لەسەر تایبەتمەندیە دیارەکانی ڕادەوەستێت.

٢-سوسە لە بەردەوامی و ژیان و جوڵەدا هەیە، بەڵام شیکردنەوە لە جێگیر و نەگۆڕدا.

٣-شیکردنەوە لە زانستە بیۆلۆجیەکان تەنها لەسەر ڕوونکردنەوەی دیوی دەرەوەی دیاردەکان و پەیوەندی بە جۆرەکانی تری زیندەوەرانەوە هەیە، بەڵام سوسە دەرک بە زیندەوەر لەناو ژینگەی سروشتی خۆی دەکا و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دیاری دەکات.

٤-شیکردنەوەی لە جیهانی دەروناسیدا، تەنها کۆمەڵێ سیفاتی زۆری دۆخە دەروونیەکانمان بۆ دەخاتە ڕوو، توانای نییە حەقیقەتی دەروون و زیندوێتی و بەردەوامی ئاشکرابکات، بە پێچەوانەوە ڕێبازی جێشتاڵەت و میتۆدە سوسە کەی دەتوانێت لایەنی زۆر لە هەست و شعوری دەروون دیاریبکات.

٥-کاتێ شیکردنەوە، بابەتی لێکدراو بۆ بەشەکانی شیدەکاتەوە، ئەوە ئاماژە بە شتێک دەکا لە ڕێگای شتێکی ترەوە، بۆیە زانین بەهۆی شیکردنەوە کەموکورتە.

ئەمە داوای برجسونە لە زاناکان کە تەنها پشت بە میتۆدی شیکردنەوە نەبەستن لە شیکردنەوەی بابەتەکان، بەڵکو لە هەمان کاتدا بۆ زانینی خۆیان بگەڕێنەوە، کە بەشێوەیەکی گشتگەرا دەڕوانێتە بابەتەکە و ناخی دیاریدەکات، ئەم داوایە بەشێکی زۆر لە زاناکان بانگەشەیان بۆ کردووە لەوانە "جۆرج سارتون" داوای زیندوکردنەوەی تێڕوانینی ئەبوقراتی لە پزیشکیدا دەکرد . بەم جۆرە لایەنە جیاوازەکانی ئاڕاستەی گشتگەرا ڕوون دەبێتەوە وەک "هاوسەنگی - مەبەستگەرایی - سەرناسی یان سوسە" لە پێکهێنانی چوارچێوەیەکی گشتی بۆ سیستەمی پزیشکی کۆن.

**لێرەدا ئاماژە بە هەندێ لە نمونەکانی ئەبوقرات دەکەین لە کتێبی "بەشەکان":**

-پزیشکی پیشەیە، پیشەیەک کە تەواوکارە لەگەڵ کاری سروشتدا.

-سروشتی مرۆیی کار لەسەر ئەوە دەکات هەرچیەک زیانی هەبێت دووری دەخاتەوە و هەر چیەک باش بێت دەیهێڵێتەوە.

-نەخۆشی بریتییە لە دەرکردنی ئەوەی بەسودە یان مانەوەی ئەوەی زیانبەخشە.

-کاری پزیشک بەراورد دەکرێ بە کاری سروشت لە مانەوەی ئەوەی بە سودە و دەرکردنی ئەوەی زیانبەخشە.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە لەسەر دۆخە ناساغەکان پێویستمان بە بەڵگەهێنانەوە هەیە ئەویش بریتییە لە "قیاس- پێوەر"، خۆی ئەبوقرات لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، کە قیاس کارێکی قورس و دژوارە، مەبەست لە قیاس کارکردنی پزیشکە هاوشێوەی سروشت، واتا گەڕانەوەی ساغی و دەرکردنی ناساغی. لەم نمونانەی خوارەوە زیاتر ئەو باسە ڕوندەبێتەوە:

**نمونەی یەکەم:**

-سروشت کار لەسەر مانەوەی سود بەخشەکان دەکات و دەرکردنی زیان بەخشەکان "پێشەکی گەورە".

- دەکراو بەسودە نەک زیان بەخشە.

-کەواتە سروشت بێ توانایە لە گرتنی سودەبەخشەکان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەخۆشیەکە هەراسان و بێ توانای کردووە.

**نمونەی دووەم: تایبەت بە گرفتەکە یان پرسیارەکە**

- ئایا پزیشک دەستپێشخەری لە دەرکردنی چەندین کرم و کێم دەکات ؟ بێ ئەوەی چاوەڕوانی گەشەکردنیان بکات کە ڕەنگە ببێتە هۆی درێژبوونەوی تەمەنی نەخۆشیەکە، یان دوای گەشەکردنیان دەستدەکات بە دەرکردنیان.

**وەڵامەکە لە شێوەی قیاس:**

- پزیشکی لاساییکردنەوەی سروشتە و کاری پزیشکیش ئەنجامدانی ئەو لاساییکردنەوەیە "پێشەکی گەورە".

- دوای گەشەکردنی سروشتیانە، پاڵ بە کرم و کێمەکانەوە دەنرێت بۆ دەرچوونیان، چونکە نەرمی کەرەستەکە ڕێگرە لەوەی بە ئاسانی بێتە دەرەوە "پێشەکی بچووک".

- کەواتە پاکی برینەکە و تەندروستی تەواو دوای دەرکردنی کەرەستەکە دەبێت کاتێک بە تەواوی گەشەی کردووە.

لێرەدا وێنەکە بە ناکامڵی دەمینێتەوە، تا بۆچوونی مرۆڤ بەرامبەر بە گەردوون لە ڕووی فەلسەفیەوە ڕووننەکرێتەوە، هەروەها ڕۆڵی سروشت لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە و چارەسەرەکەی لە ڕوانگەی پزیشکیەوە، پێشتر ئاماژەمان بە تێڕوانینی هرزی کۆن داوە، مرۆڤ لەو ڕوانگەیەوە گەردوونی بچوکە و گەردوونیش مرۆڤی گەورەیە. ئەم بیرۆکەیە "بیرۆکەی گشتگەرا" لە تێڕوانینی مرۆڤی کۆن باوبووە بۆ پەیوەندی بە سروشتەوە، پەیوەندیەکی ئەندامیە تیایدا ئەندامەکان کۆدەکاتەوە لە سێگۆشەی "جەستە - دەروون - ناوەندی کۆمەڵایەتی - ژینگەیی".

لە هرزی چینی کۆندا وشەی هەریەک لە جەستە و دەروون یەک واتا و ئاماژەیان هەبووە. بەڵام لەنێوان مرۆڤ و گەردوون لە باوەڕی تاویزمدا، مەبەستەکە کۆنترۆڵکردنی سروشت نەبووە، بەڵکو هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و تێکەڵبوون بووە، چونکە مرۆڤ لە سروشتەوە دروستبووە و لە باووشی سروشتدا دەژیەت. لێرەدا دەبینین دامەزرێنەری دووەمی تاویزم "تشوانج تزو" دەڵێت: "ئەوەی سروشتیە چاکە و ئەوەی دەستکردە خراپە".

بە نمونە سروشت چوار پێی بە ئەسپ داوە بۆ ئەوەی غار بدات، بەڵام ئەوە مرۆڤە لغاوی دەکات، هەروەها پێیەکانی مراوی کورتن ئەگەر مرۆڤ هەوڵبدا درێژیان کاتەوە دەبێتە هۆی ئازار بۆ مراویەکە، ئەوانەی لاقەکانیان درێژە ئەگەر هەوڵبدرێت کورت بکرێنەوە دەبێتە هۆی نەهامەتی بۆ زیندەوەرەکە، بۆیە بۆمان نیە ئەوەی سروشتیانە درێژە کورتی کەینەوە و بە پێچەوانەوەش ڕاستە. بۆیە ژیانکردن بە هاوتەریبی لەگەڵ سروشتدا دەبێتە هۆی بەختەوەری، شوێنکەوتنی ئەوەی مرۆڤ پێشکەشی دەکات سەرچاوەی نەهامەتیەکانە، هەرچەندە مرۆڤ هەوڵبدات بۆ جڵەوکردنی سروشت ئەوەندە نەهامەتی بۆ خۆی بەرقەرار دەکات، واتا "ناتوانین سروشت بە ویست و ئارەزووی خۆمان ڕابێنین"، ئەمە دژ و پێچەوانەی خواستی دیکارتە کە دەڵێت: "مەبەستم لە دانانی فەلسەفە "فەلسەفەیەکی پراکتیکیە لەجیاتی فەلسەفەی کۆن، بەوەی خۆمان بکەین بە خاوەن سروشت و دەستی بەسەردا بگرین".

بنەمای هاوتەریبی و هاوسەنگی و گونجاوی، لەگەڵ سروشت بۆ شارستانیەتە کۆنەکان دەگەڕێتەوە، بە تایبەت یۆنانی کۆن وەک ئەوەی لە ئەفسانەی "ئایروس" هاتووە، کە باس لە خوشەویستی دەکات. پلاتۆن لە

دیالۆگی "فایدۆن" ئاماژەی بۆ کردووە، هەروەها لە نامەی ئیبن سینا دەربارەی "عیشق" هاتووە کە هێزی عیشق لەسەرجەم هەبووەکاندا هەیە بۆ گەیشتن بە چاکە و کاملبوون، لای ئیبن عەرەبیش بەهەمان شێوە باس لەوە کراوە کە "خۆشەویستی" سەرچاوەی بوونە.

بۆیە ئەم تێڕوانینە فەلسەفیە ڕەنگدەداتەوە لە پزیشکیدا دەربارەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت بە تایبەت لە پێناسەی پزیشکیدا. "پزیشکی پیشەیە و هەموو پیشەیەکیش لاسایکردنەوەی سروشتە، لەسەر پزیشکە تەنها لاسایی کاری سروشت کاتەوە".

ئەگەر سروشت ڕۆڵی هەبووە لە چارەسەرکردنی دەردەکان، ئەوەندەش ڕۆڵی نەرێنی هەبووە لە سەر تەندروستی مرۆڤەکان، بەوەی جەستەکان یان لاشەکان . بە بۆچوونی ئەبوقرات بە پێی ناوچە و شار و هەواو ئاوەکان دەگۆڕێت، بۆیە ئەگەر بۆ پزیشک هەبێت لاسایی سروشت بکاتەوە، ئەوە بۆ نەخۆش ئەرکە ئاگای لە گۆڕانکاریەکانی بێت. لەسەر پزیشک ئەرکە کاتێک دەچێتە شارێک زانیاری لەسەر هەڵکەوتەی جوگرافی شارەکە هەبێت "ڕۆژئاوا - ڕۆژهەڵات - باکور - باشور - بیابان

- دارستان - بەردەڵان - لماوی - شاخاوی - دەشتایی". تەنها سروشت لە گۆڕانکارییە کەش و هەواکاندا نییە، بەڵکو کاریگەری جیاوازی ڕووی مانگ لەسەر دۆخی سایکۆلۆجی و هەڵچوون و شڵەژانی کەسەکان هەیە، هەروەها ڕۆڵی خۆی لە کاری پزیشکیدا هەیە ،بۆ دەستنیشانکردنی دۆخەکە.

لێرەوە دەبینین پەیوەندی نێوان ژینگە و کات و شوێن و تەندروستی مرۆڤ، پەیوەندیەکی توندوتۆڵە، بەتایبەت سێگۆشەی "سروشت - کاتی فەلەکی - تەمەنی مرۆڤ"، بە نمونە ئەبوو زەیدی بەلخی دەڵێت: "وەرزەکانی ساڵ هاوشێوەیە لەگەڵ تەمەنی مرۆڤ، منداڵی و لاوی و گەورەیی و پیربوون، بە نمونە لە تەمەنی منداڵیدا خوین باڵادەستە، ئەم باڵادەستیە لە وەرزی بەهاردا دەبێ، لە لاویدا باڵادەستی بۆ زەردیە ئەمە لە هاویندا دەبێ، لە گەورەبوون باڵادەستی بۆ ڕەشییە ئەمە لە وەرزی پایزدا دەبێ، بەڵام لە پیریدا باڵادەستی بۆ بەڵغەم دەبێ ئەمە لە وەرزی زستاندا دەبێ. هەروەها لە بەهاردا زیاتر مرۆڤ ڕووبەڕووی وەسواس و شێتبوون و جەڵتە دەبێتەوە، بەڵام لە وەرزی هاویندا توشی گەرمی و برین و کێم و کەڕو دەبن، لە پایزدا ڕووبەڕووی تەنگەنەفسی و ڕەبۆ و برینی گەدە، وە

لە زستاندا تووشی پەتا و سەرما و نەخۆشیەکانی سی دەبێت. بۆیە ئەبوقرات ئامۆژگاری پزیشکان دەکات کە پێویستە ڕەچاوی کاتەکانی ساڵ و تەمەنی نەخۆشەکان بکەن.

لە پزیشکی چینیدا سروشت زیاتر سیمای گشتگەرا وەردەگرێ لەوەی کە تەنها بریتیبێت لە کاریگەری کات و شوێن لەسەر تەندروستی کەسەکان، چونکە ئەو وزەی لە سروشتی مرۆڤدا دێت و دەڕوات سەرچاوەی خۆی لە هەواو خۆراکەوە وەردەگرێ، خۆراکی سروشتی نەک دەستکرد "لە قوتوکراو"، واتا خۆراک و هەوا وەک وزە وایە بۆ ئەندامەکانی لەش، بۆیە هەر گۆڕانکاریەک لە سروشتدا ڕوبدات کاریگەری دەبێ لەسەر توانا و وزەی ژیانمان، واتا تەقینەوەی وزەکان لە بەهاردا کاریگەری گەورەی دەبێ لەسەر ڕووەک و بوونەوەران و مرۆڤ، بۆیە زۆربەی کەسەکان کاتێ وەرزی بەهار دێت هەست بە هەڵقوڵانی وزەیەک دەکەن لەناو جەستەیاندا، ئەو وزەیەش لە شەو و ڕۆژدا دەگۆڕێ، لە شەودا لایەنی ئەرێنی "یەن" بەڵام لە ڕۆژدا لایەنی ئەرێنی "یانگ" باڵادەست دەبێت.

لەتەک هەموو ئەمانەشدا جیاوازیەکانی دەرکەوتنی ڕووی مانگ کاریگەری لەسەر دۆخی سایکۆلۆجی زۆربەی کەسەکاندا هەیە ، وەک چۆن ساڵی هەتاوی پەیوەندی بە جەستەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە ژمارەی خاڵەکانی دەرزی ئاژنین ٣٦٥ خاڵە بە ئەندازەی ڕۆژەکانی ساڵ، چونکە ئەو جیهانە بچوکەیە کە تیایدا جیهانی گەورە دەردەکەوێت.

## تەوەری یەکەم: ئایا پزیشکی نوێ شوێنی هیچ ڕێبازێکی فەلسەفی نەکەوتووە یان ناکەوێت؟

باسکردنی ئەوەی کە پزیشکی نوێ و ئەزموونی بنەما و کاتیگۆری فەلسەفی هەیە، بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەکانی لە کارکردنی باسەکە لە ناوەندی پزیشکی نوێدا کە پەسەندکراو نیە، بەڵکو ئەم باسە ڕووبەڕووی دژایەتی بووەتەوە لەوکاتەی کە پزیشکی لە قۆناغی کۆنەوە گواستراوەتەوە بۆ قۆناغی نوێ، گواستنەوەیەک لە قۆناغی فەلسەفەوە بۆ قۆناغی زانست، بەم جۆرە پزیشکی لە ڕێبازە فەلسەفییەکانی ڕزگاربووو.

کلود برنار دەڵێت: "پزیشکی ئەزموونی "تاقیکاری"، ڕێبازیکی تازە نییە لە پزیشکیدا، هەروەها پێویستی بە هیچ ناولێنانێکی ڕێبازی نییە، چونکە نە گیانداریە و نە بێگیانی و نە ئەندامیە و نە میزاجیە، بەڵکو ئەوە زانستە

"ئەوەی هەیە تەنها زانستە". ئەگەر پێویست بکات ڕێبازێک بۆ پزیشکی نوێ هەبێت ئەوەیە، کە ڕێبازی نەبێت یان بێ ڕێبازی بێت، چونکە سروشتی کارکردنی پێچەوانەی بوونی هەموو ڕێبازێکە.

## بۆ وەڵامدانەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونەی سەرەوە:

١-حەق بە کلود برنارده کاتێک بوونی ڕێبازی بۆ پزیشکی نوێ ڕەتکردەوە، بەڵام ئەوە واتای ئەوە نیە بەگشتی بە ناوی زانستەوە لە دەسەڵاتی فەلسەفە ڕزگاری بووە، چونکە ڕەتکردنەوەی ڕێبازی زیندوێتی واتا پەسەندکردنی ڕێبازی مادەیە، ئەمە زیاتر لە ئاماژەکانیدا بۆ ناچارە کی" دەردەکەوێت کە لە بواری پزیشکیدا بەکاردێت، "ناچارە کی" بۆ خۆی ڕێبازێکی فەلسەفیە"، ئەگەر ئەو جیاوازی نێوان بوونەوەرە ئەندامیەکان و نائەندامییەکان کە جیاوازییە لە سروشتدا پەسەند نەکات ، ئەوە پردێک لەنێوان جیهانی زیندەوەران و جیهانی بێ گیانەکان دروستدەکات، وە دواجاریش دیاردە بیۆلۆجیەکان بۆ دیاردە فیزیکی و کیمیایەکان

بگەڕێنیتەوە ئەمە بۆ خۆی ئاڕاستەیەکی ڕەتکردنەویە کە بریتییە لە ئاڕاستەیەکی فەلسەفی. بەم جۆرە ناتوانین بڵێین پزیشکی نویێ خاوەنی هیچ ڕێبازێکی فەلسەفی نییە.

ئەو مافی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکات کە پزیشکی نویێ بە تەواوی دەستبەرداری "تیۆرەی حەزە کان بێت"، چونکە جیاوازی بیۆلۆجی لە نیوان تاکەکان دروستدەکات، لە بەرامبەردا بنەمای لێکچوونی بیۆلۆجی نێوان تاکەکان پەسەند دەکات، بگرە ئەم بنەمایە درێژ دەبێتەو بۆ جیهانی زیندەوەران. هەروەها ڕاستی فەرمووە کاتێک ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ناکرێ ڕێبازی پۆزەتیڤیزمی ڕێبازە فەلسەفیەکان بەناوی زانستەوە ڕەتکاتەوە، چونکە خودی ڕێبازی پۆزەتیڤیزمی ڕێبازێکی فەلسەفیە. هەروەها ناکرێ بە ناوی زانستەوە پزیشکی نویێ بانگەشەی ئەوە بکات کە لە ڕێبازی فەلسەفی ڕزگاری بووە، چونکە ئاڕاستەی زانستخوازی، ڕێبازێکی فەلسەفییە، لە گرنگترین سیماکانی ئەم ڕێبازەش بریتییە لەمانەی خوارەوە:

١-هەڵهێنجنان وەک میتۆدی کارکردن و ئەزموونئەگەریتی، ڕێباز و خەسڵەتی ئاڕاستەی زانستخوازیە.

٢-پشتبەستن بە ئاڕاستەی میکانیکی و دانپێدانان بە بنەمای حەتمیەت وەک جێگرەوە بۆڕێبازی زیندوێتی.

٣-پشتبەستن بە شیکردنەوە، شیکردنەوەش لایەنی فەلسەفی خۆی هەیە، چونکە دووەم قۆناغی میتۆدە کە دیکارت بناغەکەی داڕشتووە.

٤-پشتبەستن بە بنەمای "گەڕانەوە"، واتا گەڕانەوەی دیاردە بیۆلۆجیەکان بۆ بنەما فیزیکیەکان و کیمیاییەکان. بەوەی زنجیرەیەکی سێگۆشەی لە نێوان بوونەوەران هەیە لە جیهانی بێ گیانەکانەوە بەرەو جیهانی زیندەوەران تا دەگاتە لوتکەی سێگۆشەکە کە مرۆڤە. لەم تێڕوانینەدا ئەوەی لە ژێرەوەیە کاریگەری دەبێ لەسەر ئەوەی لە سەرەوەیە نەک بە پێچەوانەوە، وەک ئەوەی فەیلەسووفانی کۆن و فەیلەسووفە ئیسلامییەکان باوەڕیان وابووە.

لێرەدا دەمەوێ ئەوە بیێژم، کە شتێک نییە ناوی ڕزگاربوون بێت لە ڕێبازە فەلسەفییەکان بەرەو "نا-ڕێبازی" یان "نا- فەلسەفە". ئەگەر نیازت لە

فەلسەفە هەبێت دەبێ فەلسەفاندن ئەنجام بدەی "ئەرستۆ"، بە هەمان شێوە ئەگەر دەتەوێت لە ڕێبازێتی ڕزگارت بێت ئەوە دەبێ ڕێبازی بێت ئەمە بۆ پزیشکی ڕاستە.

واتا تێگەی زانست تەنها زاناکان ڕۆڵیان نەبووە لە داڕشتنی، بەڵکو فەیلەسووفەکانیش ڕۆڵی گەورەیان هەبووە تیایدا، چونکە فەیلەسووفانی سەدەکانی "١٧-١٨" تێڕوانینێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ پێداویستییەکانی زانست هەبووە. بە نمونە "یاسای دووەمی میتۆدەکەی دیکارت" "یاسای شیکردنەوە"، تەنها بۆ گرفتە فەلسەفییەکان نەبووە، بەڵکو لەسەرجەم زانستەکان کارپێکراوە. ئێمە ئەگەر باس لە پێشکەوتنی زانستی نوێ بکەین ئەوە دەبینین، کە فەلسەفە ڕۆڵی خۆی هەبووە، لە تێپەڕاندنی میتۆدەوە بۆ ڕێباز. لەم پێوەدانگەیەوە "دیکارت" باوکی فەلسەفەی نوێ، دەڵێت: دەتوانین بە ڕێگای یاساکانی فیزیا و کیمیا ڕاڤەیەکی میکانیکیانەی ئەو دیاردانە بکەین، کە لە جیهانی زیندەوەرانەوە دەردەکەون، بگرە جەستەی مرۆڤ ئامرازێکە دەکەوێتە ژێر کاریگەری یاسا میکانیکیەکانی فیزیا و کیمیا و زیندەزانی.

ئایا ئەمە خاڵی سەرەتا نییە لە بنەمای "گەڕانەوە _ الرد" کە زانستە نوێیەکان لەناویاندا پزیشکی پشتی پێ بەستوە؟

## ڕەخنەگرتن لە دیدی فەلسەفییەوە لە بنەمای مەبەستگەرایی بۆ پشتیوانیکردن لە بنەمای ناچارکی لە دیدی پزیشکی:

أ-ڕەخنەگرتن لە مەبەستگەرایی لە دیدی فەلسەفییەوە: پێشتر ئاماژە بە پەیوەندی نێوان ئاڕاستەی زیندوێتی و ئاڕاستەی مەبەستگەرا دراوە، مەبەستگەرا بووە کۆسپێک لەبەردەم دەرکەوتنی ئاڕاستەی مادی، کە دەبووایە تێپەڕێندرێت، کورتەی ئەو ڕەخنانە بریتیین لە :

- سروشت بێ مەبەستگەرایە، ئەوە مرۆڤە مەبەست و ئامانجەکانی خۆی دەداتە پاڵ دیاردە سروشتیەکان، خۆی وەک ناوەندی گەردوون ناساندوە، پێیوابووە سەرجەم دیاردەکان بۆ بەدیهێنانی خواست و ئامانجەکانی ئەو کاردەکەن، بۆیە وێنای ئەوەی کردووە بەفر بارین و ئاو باران بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵەکان و خواردنەوەی ئەو ڕویانداوە.

- ئەم پرسیارە ورووژێنەرە: ئامانج و مەبەستەکان چۆن ڕێگاکانیان لە جیهانی سروشتیدا دەدۆزنەوە؟ ئەوانە مەبەستگەرایانە بیریان دەکردوە کە

ناچاربوون بڵێین: "بوونی هێزێکی زیندوو لەناو بوونەوەردا کار بۆ گەیشتن بەو ئامانج و مەبەستانە دەکات، یان بۆ مانەوەی خود یان مانەوەی جۆر لەناوچوون.

- لە ڕێبازی مەبەستگەرایی بابەتەکان سەرەوژێر دەکرین، کاتێک بیر لە کۆتا بابەتەکان دەکاتەوە بۆ ڕێکخستنی بابەتە سەرەتاییەکان.

- مەبەستگەرایی واتا بیرۆکەی داهاتوو بڕیار لەسەر ئێستا دەدات، "داهاتوو ئێستا دیاریدەکات"، بەڵام سروشت ئەمە نازانێت "داهاتوو بۆ هەموو ئەگەرەکان کراوەیە "پوپەر".

- ئەم ڕێبازە لە ڕووی لۆجیکییەوە ئاڵۆز و لێڵە ( کاتێک کۆتا بابەتەکان دەخاتە پێش بابەتە سەرەتاکان)، لە ڕووی فەلسەفییەوە نەزۆکە ( کاتێک سنورێک بۆ زانینی مرۆیی دیاریدەکات تێپەڕاندنی ئەستەمە)، واتە لە ڕووی زانستییەوە هەڵەیە( تاقیکردنەوە زانستییەکان ئەو هێزە شاراوانە دیاریناکات کە هۆکارەکان دەڕەخسێنێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان.

ب- ناچارەکی پێویستییەکی گرنگە لە زانستە بیۆلۆجیەکان:

**١- شتێک نییە بە ناوی " هێزی زیندوێتی" لە ستراکچەری بوونەوەری زیندوودا.**

تەنها ڕەخنەگرتن لە مەبەستگەرایی وەک دەستپێکێک بۆ حەتمیەت بەس نییە، بەڵکو دەبێ کار بۆ لەناوبردنی ئەو بنەمایە بکرێ کە ڕێبازی زیندوێتی لەسەری بوونیادنراوە، کە بەو هۆیەوە جیاوازی نێوان بوونەوەری زیندوو و بێ گیان تەنها جیاوازیە لە ڕووی سروشتەوە نەک پلەوە، ئەو بنەمایە بریتییە لە " بنەمای زیندوو یان هێزی زیندوێتی کە دەوترێ بە نێو هەموو جەستەدا بڵاوە.

وەک چۆن لە فیزیادا شتێک نییە ناوی " هێزی کانزایی" بێت بەهەمان شێوە لە بیۆلۆجیادا شتێک نییە ناوی " هێزی زیندوێتی" بێت، چونکە هەر یەک لە پزیشک یان زانای فسیۆلۆجی هیچ کات بە دوای هۆکاری ژیان یان جەوهەری نەخۆشیدا ناگەڕێن، لەبەرئەوەی "هوکار و جەوهەر" دوو تێگەن لە ڕاستیدا بوونیان نییە. هەندێ لە پزیشکان هەڵەی کوشندە دەکەن، کاتێ دەڵێن ژیان کاریگەری شاراوەی هەیە بەسەر سروشتەوە و لە دەرەوەی حەتمیەت و بە ئازادانە ڕەفتار دەکات. واتا ڕەتکردنەوەی بۆچوونی " هەبوونی هێزی زیندوێتی لە ژیان" ئەرکی زانستە. مەرج نییە

دیاردەیەک لە ناوەوەی جەستە ڕوبدات، لەبەرئەوەی لە دەرەوەی جەستەی زیندەوەر ڕوویداوە، ئەم جیاوازیە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە شتێک هەیە ناوی "ژیانە" و ڕێگرە لەوەی ڕوبدات، بەڵکو ئەوەی هەیە نەبوونی مەرجی ڕوودانی دیاردەکەی لەناو جەستە وەک ئەوەی لە دەرەوەی جەستەکە مەرجی ڕوودانەکە هەیە، بە نمونە وتراوە کە "ژیان" ڕێگرە لەوەی مەیین فابرین لەناو دەمارەکانی بوونەوەری زیندوو ڕوبدات وەک ئەوەی لە دەرەوەی ڕوودەدات، بەڵکو ئەمە بە هۆی چەند هۆکارێکی فیزیکی تایبەت ڕوودەدات و هیچ پەیوەندی بە "ژیانەوە" نیە.

لەم دیدگایەوە دەکرێ شەکر لەناو جگەر لە دوای مردن زیادبکات وەک ئەوەی لە ژیاندا هەیە، ئەمە هۆکاری ئەوە بوو بەشێک لە فسیۆلۆجیەکان بکەونە هەڵەوە لەوەی "ژیان" کاریگەری هەبێت لە زیادنەکردنی ڕێژەی شەکر لە جگەردا لەکاتی ژیاندا. سەیر ئەوەیە لە سەردەمی خۆماندا گوێبیستی ئەوە بین، هەموو ئەوەی هەیە پەیوەندی بە بوونی مەرجی سروشتییەوە هەیە، یان نەبوونی مەرجەکە، جگە لەمە هیچ شتێکی تر بوونی نیە.

**٢- سەرجەمی ئەوەی هەیە ملکەچە بە ناچارەکی"زیندەوەر و بێ گیان":**

زانای فیزیایی و زانای فسیۆلۆجی کار بۆ ئەوە دەکەن بگەنە "هوکاری" دیاردەکە لەپێناو دەستبەسەراگرتنی بابەتەکە و پێشبینیکردنی دەرکەوتنی لە داهاتوودا. هەر کاتێک مەرجە پێویستییەکانی دیاردەکە دەرکەوت ئەوا پێویستە دیاردەکە ڕوبدات، ڕەتکردنەوەی ئەمە خۆی لە خۆیدا ڕەتکردنەوەی زانستە، ئەمە بنەمایەکی ڕەها و گشتگیرە لەسەرجەم زانستەکان و هیچ بوار بۆ کاریگەری ژیان نییە لەسەریان. بۆیە ناچارین بڵێین: "یان ناچارەکی لە دیاردە بیۆلۆجیەکاندا هەیە، یان ڕێکەوت و کوێرانە دیاردەکان ڕوودەدەن، بێ هەبوونی یاسا و ڕێسا.

هەرچەندە دیاردەکان جیاوازیان هەیە " دیاردەی بیۆلۆجی - دیاردەی بێگیانی"، بەڵام یاساکان یەکن لە کاریگەری و ناچارەکی ڕووداوەکان. پێویستە ئەمە لە مەعریفەی پزیشکدا جێگیر بێت وەک کەسێکی تاقیکاری، ئەگەر بەم جۆرە بوو، ئەوە هەموو شتێکی تر ڕەتدەکاتەوە بەدەر لە یاساکان کاریگەریان لەسەر دیاردەکان هەبێت.

لێرەدا زاناکە لەسەر بنەمای "یاسای نەگۆڕ و جێگیر" کاریکرد، باوەڕی ئەوەی لا دروستدەبێ کە "دیاردەکان دژ بەیەک نابن ئەگەر لە هەمان بارودۆخدا بینران". هەر کاتێک گۆڕانێک بینرا ئەوە بەهۆی دۆخی ترەوە دروستبووە کە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم دەرکەوتنی دیاردەکە، بۆیە ناچارە شوێن دۆخە گۆڕاوەکان بکەوێت، چونکە هیچ ئەنجامێک بە بێ هۆکار نییە.

کەواتە ناچارەکی بناغەی هەموو پێشکەوتنێکی زانستییە، هەموو دەربڕینێکی تر جگە لەمە دژ و ناکۆکە لەگەڵ زانست، ئێمە تەنها ڕێگە بەوە دەدەین باس لە دیاردە و تایبەتمەندی بکرێ، کە مەرجی ڕوودانی نادیار و نەزانراوە و ڕێگە بە هیچ باوەڕێکی تر نادرێت، باس لە بوونی بنەمایەکی تر بکات، ڕێگری لە ڕوودانی دیاردەیەک بکات لە دەرەوەی زانست، بۆیە هیچ جۆرە ئیستیسنا نە بۆ پزیشکی و نە زانستەکانی تر نیە، پێشتر دەمانوت ئەگەری هەیە یان چاک دەبێتەوە یان چاک نابێتەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئەگەر هوکارکە ی بزانین ئەوە بە دڵنیایەوە چاک دەبینەوە.

**٢-ڕۆڵی ڕێکەوت –دژ نییە لەگەڵ: ناچارەکی**

بە نمونە ئەگەر نەخۆشێک بە نەخۆشیەکی نادیارەوە سەردانی نەخۆشخانە یان نۆرینگەی پزیشکێک بکات، گومان لەوەدا نیە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە لەلایەن پزیشکەکەوە بۆ ڕێکەوت بگەڕێتەوە. ئەمە بە هەمان شێوە لە زانستەکانی تریش وایە، بە نمونە ڕووەکناسێک لە گوندێک بە ڕێکەوت ڕووەکێک دەدۆزێتەوە کە پێشتر هیچی لە بارەوە نەزانیوە، هەروەها فەلەکناسێک ڕەنگە بە ڕێکەوت تەنێک لە ئاسمان ببینێت کە پێشتر نەیبینیوە، بۆیە دەکرێ هەموو زانینی مرۆیی سەرەتا بە بینینی ڕێکەوتانە ڕوویدابێت، چونکە لە توانای مرۆڤدا نیە بەبێ بینین هیچ دەربارەی شتەکان بزانێت، وە دەکرێ سەرەتا بە ڕێکەوت ئەوانەی بینیبێت. بەڵام مرۆڤ بەوەندە کۆتایی بە پرۆسەکە ناهێنێت، بەڵکو هەڵدەستێ بە تەماشاکردنی زیاتری بابەتەکان و بەراورد لەنێوان ڕووداوەکان دەکات، ئەنجامی تازە بەرهەمدێنێت، لێرەوە ڕۆڵی ڕێکەوت کۆتایی دێت و قۆناغ و ڕۆڵی هەلهێنجان دەستپێدەکات. لەسەر پزیشکە ڕێکەوت لە دەستی دەرنەچێت دوای ئەوەی بە وردی تەماشای کردووە، چونکە ڕێکەوت بە خاڵی دەستنیشانکردن و چارەسەر دادەنرێت، بگرە زۆربەی کاریگەریە خراپەکانی دەرمانەکان بە ڕێکەوت دەرکەوتوون. بەڵام

ئەمە واتای ئەوە نیە پزیشک بە ڕێگای زانینی سوسەیی گەیشتووەتە ئەو دەستنیشانکردنە، هەر کەسێک بەو جۆرە بیربکاتەوە ئەوە دەرچوونە لە خانەی زانست، بۆیە پێویستە ئەو جۆرە بیرکردنەوانە وەڵام بدرێنەوە و ڕێگە نەدرێت تەشەنە بکات، چونکە دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ڕووناکی زانست و ڕێگە بۆ جادو و فاڵ و فێڵکردن خۆشدەکات.

لێرەدا دەبینین زۆربەی پزیشکان شانازی بەوە دەکەن چارەسەرێکی تاقیکردووەتەوە و بە ڕێکەوت نەخۆشەکەی پێ چاک بووەتەوە، خۆی لەبەردەم باوەڕێک دەبینێتەوە کە چاکبوونەوەکە بۆ چارەسەرەکەی نەگەڕاوەتەوە، بەڵام لەسەر پزیشک ئەرکە ڕووبەڕووی ئەو لەخۆباییبوونە بێتەوە و خۆی بە روحی زانستیەوە پابەندکات تا ئەو کاتەی بۆچوونەکەی لە ڕێگای تاقیکردنەوەی زانستیەوە دەسەلمێنرێت، بۆیە پێویستە پزیشکان هەندێ پرسیاری لەم جۆرە لە خۆیان بکەن: "ئایا ناکرێ چارەسەرەکە بەهۆی فاکتەر و هۆکاری ترەوە ڕوویدا بێت نەک بە هۆی چارەسەرەکەی خۆی؟ چۆن بۆمان دەڕەخسێت هۆکاری چارەسەرەکە بزانین - ئەم دەرمانە بوو یان سروشت بوو؟

**٤- ڕێبازی مادی و ئاراستەی میکانیکی: لیدەرمان لە کتێبی " فەلسەفە و پزیشکی" ئاماژە بە دوو فەلسەفە دەکات بۆ پزیشکی.**

**فەلسەفەی یەکەم: بریتییە لە ڕێبازی مادی "میکانیکی".**

**فەلسەفەی دووەم: بریتییە لە ڕێبازی گشتگەرا، پێشتر باسمان کردوون.**

لێرەدا دەتوانین پرسە بنەڕەتییەکانی ڕێبازی مادی بۆ ئەمانەی خوارەوە دیاریبکەین:

- سەرجەمی بوون مادەیە و هیچی تر، جگە لە مادە بوونی نییە، ئەوەی مادی نەبێت بوونی نییە.

- پێویستە تەوەرە زانستیەکان پابەندی ڕوونکردنەوەی مادی بن، ئەوەی پابەند نەبێت زانستی نییە، چونکە مادییەت یەکسانە بە بیکردنەوەی زانستی.

- جیاوازی نێوان جیهانی زیندەوەران و جیهانی بێگیانەکان، جیاوازە لە پێکهاتەی کیمیایی نێوان کەرەستە ئەندامییەکان و نائەندامییەکان، ژیانیش بریتییە لە مادەی هایدرۆکاربۆنی.

- کاربۆن سەرچاوەی وزەی کیمیاییە، چونکە یەک میوکولی کاربۆن بیست گەردیلە لەخۆدەگرێ، کە توانای هەیە یەک ملیۆن وێنەی جیاواز ببەخشێت، بۆیە مادەی نینوک و پرچ و ئێسک و چەرم و ماسولکە و خوێن و ماسی و توێکڵی هێلکە و هۆرمۆنەکان، هەموو ئەمانە پێکهاتەی ئاڵۆز و لێکدراون لە مادەی پرۆتینی کە لە کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە.

- پوختە: جیاوازی نێوان جیهانی زیندەوەران و جیهانی بێگیانەکان تەنها جیاوازیە لەنێوان پێکهاتە ئەندامییەکان و نائەندامییەکان، هەروەها جیاوازیە لە پلە نەک لە سروشت، چونکە گەردوون یەکەیەکی گشتیە تیایدا بێگیانەکان لە خواری خوارەوەن و مرۆڤیش لە سەرەوەی لوتکەکەیە. جەستەی مرۆڤ ماشێنیکە ، بۆیە سەرجەم پرۆسە ئەقڵیەکانی مرۆڤ وەک " بیرهاتنەوە - بیرکردنەوە " تەنها بریتیین لە پرۆسەی میکانیکی، وە سەرجەم ئەندامەکانی ئەرکەکانی وەک ماشێنێک بە شێوەی میکانیکی ئەنجام دەدات.

ج- پلەبەندی بوونەوەران لە بووندا: لە گەردیلەوە تا مرۆڤ "ڕوانگەیەکی فەلسەفی":

١- لە بنەڕەتدا یەک شت هەبووە و خاوەنی یەک تایبەتمەندی بووە ئەویش " توانای یەکگرتنی" هاوشێوەکان بووە، بۆیە "پرۆتون و ئەلکترۆن" بە سادە و نزمترین سیستەمی بوون دانراون، ملکەچی یەک یاسا بوونە ئەویش یاسای"موگناتیسی کارەبایی".

٢- یەکگرتن لەنێوان لێکچووەکان و جیاوازەکان دروستبوو، لەنێوان "پرۆتۆنات و ئەلکترۆنات" گەردیلە پەیدابوو، ئەمە سەرەتای جیهانی مادی بوو.

٣- یەکگرتنی نێوان لێکچووکان و جیاوازەکان بەردەوام بوو تا بووە هۆی دروستبوونی یەک میوکول کە جیهانی کیمیای بەرهەم هێنا.

٤- گەردیلەی کاربۆن بەهۆی سروشتی پێکهاتەکەیەوە توانای یەکگرتنی هەبووە لەگەڵ گەردیلەکانی تر و پێکهێنانی میوکولێکی لێکدراو، بەهۆی پێکهاتە ئاڵۆزەکەیەوە و یەکگرتنی لەگەڵ میوکولەکانی تر، پێکهاتەیەکی تری لێ دەرچوو ئەویش "ژیانە".

٥- دوای ئەمە، خانە دەرکەوت، هەڵگری چەندین تایبەتمەندی ژیان بوو لەوانە "بەرگری – نەرمی- جوڵە – خۆگونجاندن"، توانای یەکگرتنی هەیە لەگەڵ ئەوانیتر بۆ ئەوەی تایبەتمەندیەکان لە دەستبدات.

٦- ئەم ئاڵۆزیە گەیشتە بەرزترین پلە لە خانەی مێشکی یەکێک لە بوونەوەران، ئەویش "مرۆڤە"، تا وایلێهات دەرک بە ئەبستراکتەکان و مەعقولاتەکان بکات بە هۆی ئەقڵ و یادەوەریەوە.

٧- بەم جۆرە دەبینین کە سیستەمی گەردوونی لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەستپێکرد، بەڵام سیستەمی زانینی لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەستپێکرد.

زانستە مرۆییەکان پشت بە زانستە بیۆلۆجیەکان دەبەستێت، زانستە بیۆلۆجیەکانیش بە زانستە سروشتیەکان، چونکە یاسا مادیەکان گرنگ و پێویستن بۆ دیاریکردنی ئەو یاسا بیۆلۆجیانەی کە لەگەڵ واقیع گونجاوە، هەروەها یاساکانی ژیانیش پێویستن بۆ دیاریکردنی ئەو یاسا مرۆییانەی لەگەڵ واقیع گونجاوە. لێرەوەیە کە چاکسازی لە میتۆدۆلۆجیا کۆی وێنەکە دەگۆڕێت، بەوەی کە مەعریفە بکرێتە هەرەمێک خۆی لەسەر زانستە سروشتیەکان بونیاد بنێت، لەبەرئەوەی بناغەیەکی پتەو و جێگیرە

لەسەر ئەزموون و بەڵگە، کە تیایدا واقیع و مەعقول یەک شتن و گومان قبووڵ ناکات، کەواتە لەسەر بناغەی زانستە مادیەکان زانستە بیۆلۆجیەکان بونیاد دەنرێت و دواجاریش زانستە مرۆییەکان.

لێرەدا ئەقڵ وەک ئامرازی بیرکردنەوە کاریگەری نابێت لەسەر ڕووداوە گەردوونیەکان، بەڵکو لاسایی دەکاتەوە، بۆیە پێویستە شێوازی بیرکردنەوەکە لەگەڵ یاسا گەردوونیەکان گونجاوبێت، ئەو یاسایانەی دیاردە گەردوونیەکان بەڕێوەدەبەن، کە لە پرۆتۆنەوە بۆ مرۆڤ وەک یەکە، لە ئەلکترۆنەوە بۆ ئەقڵ، لە هەستپێکراوەوە بۆ ئەبستراکت " ڕەهایی"، لە سیستەمی گەردیلەوە بۆ ڕەفتاری مرۆڤ، بە پێی یاساکە کە گشتیە، ئەوەی لە خوارەوەیە کاریگەری هەیە لەسەر ئەوەی لە سەرەوەیە.

**٥- ڕوونکردنەوەی زانستی "تەواوکاری مەعریفی-زانینی":**

أ- شیکردنەوە و توێکاری: شیکردنەوە بریتییە لە شیکارکردنی ئەوەی لە لێکدراو بۆ سادە هەیە ، بۆ ئەو بەش و توخمانەی لێکدراوەکەیان پێکهێناوە. بۆ زانینی ڕاستی بابەتەکە تەنها شیکردنەوە گونجاوە، ئەو کەسەی داوای زانینی بابەتێک دەکات بێ شیکردنەوەی وەک ئەو کەسە

وایە نیازی سەرکەوتنی تاوەرێکی هەیە، بەڵام بێ بەکارهێنانی پلیکانەکان "دیکارت".

**لەم پێوەدانگەیەوە دوو جۆر شیکردنەوەمان هەیە:**

جۆری یەکەم "شیکردنەوەی مادی".

جۆری دووەم "شیکردنەوەی ئەقڵی".

شیکردنەوەی مادی ڕوونە کە شیکردنەوە کەرەسە کیمیایەکان بۆ ڕەگەز و توخمانەی بابەتەکەیان پێکهیناوە بەکاردێت وەک "شیکردنەوەی ئاو بۆ ئۆکسجین و هایدرۆجین". بەڵام شیکردنەوەی ئەقڵی و لۆجیکی بریتییە لە جیاکردنەوەی تایبەتمەندی شتەکان لەنێو زەیندا بە مەبەستی دۆزینەوەی پەیووەندی نێوان بەشەکانی. شیکردنەوە بەم واتایە یەکێکە لە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی لە فەلسەفە و زانستدا.

بۆیە کیمیاناس تەنها گرنگی بە دیوی دەرەوەی شتەکان دەدات، بەڵام بوونەوەری زیندوو لەگەڵ دوو ژینگە ڕەفتاردەکات ئەوانیش: "ژینگەی دەرەکی و ژینگەی ناخەکی"، بۆ ناسینی پێکهاتەی ناوەوە پزیشکان و فسیۆلۆجیستەکان پێویستیان بە توێکاری هەبوو. واتا بێ توێکاری مەحاڵە

زانستی پزیشکی و فسیۆلۆجی دروستبن، چونکە پرۆسەکانی ژیان توانای خۆئاشکراکردنی نییە، بۆئەوەی بزانین مرۆڤ چۆن دەژیەت ئەوەش پێویستە بۆ ئەندامەکانی ناوەوەی ببینین پێش ئەوەی بمرێت، کەواتە توێکارکردنی زیندەوەران شێوازێکە مەحاڵە پزیشکی دەستبەرداری بێت. لەتەک ئەوەشدا بناغەیەکی گرنگە بۆ سەرجەم توێژینەوە پزیشکیەکان. هەندێ جار پرۆسەکە وا دەخوازێت زیندەوەرەکان ژەهراوی بکرێن بۆ زانینی کاریگەری ژەهرەکە لەسەر ژیان و خوێن و پێکهاتەکانی تری جەستە. بەڵام بنەما ئاکاریەکانی پزیشکی ڕێگرە لەوەی تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ ئەنجام بدرێت، هەرچەندە ئەو تاقیکردنەوەیە سوودیشی بۆ پێشکەوتنی زانست هەبێت.

ب- گەڕانەوە " الرد": گەڕانەوەی دیاردە بیۆلۆجیەکان بۆ دیاردە فیزیۆکیمیاکان کارێکی ئاسان نیە ئەگەر ئێمە جەستەی مرۆڤ وەک ئامرازیک"ماشینێک"ی زیندوو پەسەند نەکەین، هەرچەند وانیشان دەدرێت کە بوونەوەرە زیندووەکان ئاڵۆزترن لە بوونەوەرە بێ گیانەکان، چونکە بوونەوەرە زیندووەکان دەکەونە ژێر کاریگەری ژینگەی دەرەوە و ناوەوە، بەڵام بوونەوەرە بێگیانەکان تەنها دەکەونە ژێر کاریگەری ژینگەی

دەرەوە. ژینگەی ئەندامی ناوەوەی بوونەوەرە زیندووەکان هاوکار دەبێت لە بەرگریکردنی کاریگەریە دەرەکیەکان، بوونەوەرە زیندووەکان پارێزگاری لە مانەوەی پلەی گەرمی لاشەیان دەکەن دوور لە کەش و هەوای دەرەوە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نیە کە هێزێکی نادیار کۆنترۆڵی ئەو بارودۆخە دەکات، بەڵکو ئەوە بۆ سیستەمی ناوەوەی بوونەوەرەکە دەگەڕێتەوە. واتا ئەرکی جەستەی بوونەوەری زیندوو هاوشێوەی ماشێنێکی مادی کارەکانی خۆی ئەنجامدەدات، ئەمەش بە گوێرەی یاسا میکانیکیەکان، بە نمونە "دڵ" کار لەسەر هێنان و بردنی خوێن دەکات. بۆیە ستراکچەری بوونەوەری زیندوو بەدەرنیە لە یاسا میکانیکیەکان کە جیهانی مادی بەڕێوەدەبات.

## نەسکی دووەم: هەڵسەنگاندن

**یەکەم:**

هیچ پاساوێک نییە بۆ بەراوردکردن لەنێوان پزیشکی نوێ و پزیشکی کۆن، پزیشکی نوێ بەرهەمی سەردەمی زانستە، چۆن بەراوردبکرێ لە نێوان پزیشکییەک کە پشتی بە جادو و فاڵ و ئەزموونێکی ساوا بەستووە لەگەڵ پزیشکیەک کە پشت بە تەکنیک و تاقیکردنەوەی زانستی و زانستی ئەزموونی تری وەک توێکاری و فسیۆلۆجی و خانەناسی بەست بێت. زانستی پزیشکی نوێ توانی زاڵبێت بەسەر زۆربەی نەخۆشیەکان و چەندین نەخۆشی بنەبڕبکات، هەروەها ڕێژەی مردن لەناو منداڵان کەم بکاتەوە و تەمەنی مرۆڤەکان بەرزبکاتەوە، ئەمانە هەمووی لە پێوەرەکانی شارستانییەتی پێشکەوتووە. بەڵکو بەراوردکردنەکەش لە نێوان دوو بناغەی فەلسەفیدا دەکرێ بۆ دڵنیابوون لە دوو شت:

یەکەم: ئاڕاستەی زانستی لە پزیشکی نوێدا بە تەواوی لە تێڕوانین و ڕێبازی فەلسەفی ڕزگاری نەکردووە، چونکە هەمان ئەم ئاڕاستەیە کە دەڵێت:

"ئەوەی ئەزموونی نەبێت زانستی نیە" خۆی ئەمەش تێڕوانینێکی فەلسەفییە (دیڤید هیوم).

دووەم: بەراوردکردن لەنێوان دوو بناغەی فەلسەفی جیاواز هەندێ لایەنی نەرێنی پزیشکی نوێمان بۆ دەردەخات بێ ئەوەی پێشکەوتنەکانی چاوبەستمان بکەن لە ئاست لایەنە نەرێنیەکانی، ئەمەش بۆ ماوەی یەک سەدە ئەوە لە زەینی خەڵکدا جێگیرکرا کە ئەنجامەکانی پزیشکی یەقینین، چونکە بەرهەمی تاقیکردنەوەی زانستین، ئەمە بۆ خۆی چەند تێڕوانینێکی خستەوە لەوانە:

١- پشت بەستنی پزیشکی بە ناچارەکی، بە واتا یەک دەرمان و چارەسەر بۆ دوو نەخۆش کە هەڵگری یەک نەخۆشین دەبێ یەک ئەنجامیان هەبێت. لێرەدا ئەوەی فەراموش کراوە لایەنی سایکۆلۆجی تاکە، هەروەها متمانە بە خۆبوونی تاکە، ئەمانە ئەزموونی نین و ناکەونە ژێر تێگەکانی زانستەوە، بۆیە دەکرێ دەرمانەکە بۆ یەکێکیان چارەسەربێت، بەڵام بۆ ئەوی تر مردن بێت.

٢- جۆرە جیاوازەکانی پزیشکی نوێی ئەزموونی غەیبی و خورافین یان بەلای کەمەوە ناکەونە ژێر هەژموونی تاقیکردنەوەی زانستی و تێگە زانستیەکانی زانست، بۆیە بۆ کارکردنیان لە مەیدانی چارەسەری ڕێگە پێنەدراون، ئەمە بەهۆی ئەوەی پزیشکی ڕۆژئاوایی پەنا بۆ دەستنیشانکردن و چارەسەر بەرێت. لەگەڵ ئەمەدا ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دانی بە بەشێک لەو جۆرە پزیشکیەدا داناوە وەک "چارەسەری چینی" بۆ نەخۆشیەکان.

٣- پزیشکی زانستە، وەک هەر زانستێکی تری ئەزموونی "کیمیا - بیۆلۆجی - فسیۆلۆجی". وەک ئاشکرایە ئەم زانستانە "کەڵەکبوون" "تراکمی"، بە واتای ئەوەی یاسا تازەکانی یاسا کۆنەکان پوچەڵدەکاتەوە، چونکە پێوەری ڕاستی لەم زانستانە بریتییە لە گونجانی یاساکانی لەگەڵ کۆی سیستەمی گەردوونی و ئەقڵی. بەڵام لە پزیشکیدا کارەکە جیاوازترە، پێوەری ڕاستی لە پزیشکیدا زیاتر "پراگماتیە" بە واتای بەراوردکردنی ڕاستی بە لایەنی کردارییەوە، بە نمونە دەڵێین: چارەسەرەکە گونجاوە چونکە بەسوود و چاکە، یان چارەسەرەکە گونجاوە لەبەرئەوەی باش و ڕاستە.

دووەم:

باس لە بناغە فەلسەفییەکان دەکەین کە بوونە هۆی ڕێگریکردن لە پەرەسەندنی زانستی پزیشکی ئەمەش لە ڕێگای ئەم پرسیارانەوە:

١- ئایا گشت تەنها بریتییە لە کۆی بەشەکان؟

گومان لەوەنیە کە زانستی پزیشکی نویێ گەیشت بە زانینی زۆر ورد دەربارەی ئەندامەکان و هۆی نەخۆشییەکانی لە ڕێگای پسپۆریە وردەکانی لقەکانی پزیشکییەوە، ئەم پەرەسەندن و پێشکەوتنە ڕووینەدەدا ئەگەر پزیشکی نویێ پابەندبووایە بە تێڕوانینی گشتگەرایی پزیشکی کۆنەوە، بێ گومان پسپۆری یەکێکە لە سیما گشتییەکانی هزری نویێ. بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەمەیە: ئایا مرۆڤ بریتییە لە کۆی ئەندامەکان؟ ئایا بەش بەشکردنی مرۆڤ نابێتە هۆی ئەوەی وەک بوونەوەرێکی کامڵ نەناسرێتەوە؟ لێرەدا "الكيس كارليل" دەڵێت : "مەحاڵە زانایەک پسپۆری وردی لە لقێکی وردی زانستی هەبێت بەباشی لە مرۆڤ تێبگات. زیادەڕەوی لە پسپۆری پزیشکیدا زیانی زۆری بە پزیشکان گەیاندووە لە دابەشکردنی نەخۆش بۆ چەند بەشێکی ورد و بۆ هەریەک لەو بەشانە پسپۆریەک هەیە، هەرچەندە

پزیشک لە پسپۆری خۆی زیاتر قول بێتەوە ئەوەندە مەترسیەکان زیاتر دەبن بە هۆی شارەزانەبوونی لە بوارەکانی دەرەوەی پسپۆریەکەی، وەک ئەوەی "بکمالت" زانای بەکترۆلۆجی پسپۆری خۆی بەکارهێنا بۆ ڕێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی سیل لەنێو فەرەنسیەکان لە ڕێگای بەکارهێنانی دژە بەکتریایەک کە خۆی دۆزەرەوەکەی بوو، بەڵام ئاشنا نەبووو بە تەندروستی گشتی و دۆخی خەڵک لە نیشتەجێبوون و خواردن و دۆخی کارکردن و شێوازی ژیانیان.

٢- ئایا جەستە و دەروون دوو جەوهەری جیاوازن؟

ئەمەش تێزێک بوو دیکارت دەیوەتییەوەی، هەرچەندە بە خاڵی لاوازی فەلسەفەکەی دادەنرێت. چۆن دەکرێ جەستە و دەروون دوو بوونەوەری نامۆ بن لە ناو یەک لاشەدا؟ ئەمە کاریگەری هەبوو لەسەر پزیشکی، تا ئەو ڕادەی تێگەی پزیشکی مرۆیی بۆ پزیشکی جەستەیی بەکاردەهات بێ گرنگیدانە دەروون. زاڵبوونی ڕێبازی مادی لەسەر بیرکردنەوەی زانستی پشتیوانی لەوە دەکرد، هەرچەندە ئاماژە بە دەروون دەکرا، بەڵام وەک بەشێک لە جەستە و لەژێر کاریگەری جەستەدا، بۆیە دەرونزانی

فسیۆلۆجی پشتگیری لەم بۆچوونە دەکرد. لێرەدا دەبینین "الکیس کارلیل" دەڵێت: "کەلێنی نێوان چەند و چۆن لە زیادبووندا بوو ئەو کاتەی دیکارت دوالیزیمی نێوان جەستە و دەروونی ئاشکرا کرد، دیاردە دەروونیەکان بە هۆی گرنگیدان بە جەستە وەک ئەندامی میکانیکی فسیۆلۆجی فەراموشکران، شارستانیەتی ڕۆژئاوا باجی ئەوەی دا کە گوزارشتی لە "سەرکەوتنی زانست و دارمان و هەڵوەشانەوەی مرۆڤ" دەکرد.

لە مەیدانی پزیشکیدا بۆ ماوەیەکی زۆر کاریگەری دەروون لەسەر جەستە بەو جۆرە مایەوە "فەراموشکراوی"، تا شێوەی ژیان لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکان ئەو بۆشاییەی ئاشکرا کرد، بەوەی کە پیشبڕکێی بۆ دەوڵەمەندی بووە هۆی دەرکەوتنی چەندین نەخۆشی دەروونی و کاری کردە سەر ئەندامەکانی جەستە، الکیس کارلیل دەڵێت: "فسیۆلۆجیەکان و پزیشکان ئەقڵیان بە جۆرێک فەراموشکرد لەگەڵ ئەوەی کە ڕێکخەری گەردوونە تەنها لەبەرئەوەی ملکەچی شیکردنەوەی کیمیایی نەبوو. نەخۆشییە ئەقڵیەکان زیاتر بەربڵاون لەناو خەڵکی لە نەخۆشیە جەستەییەکان، لەتەک ئەوەشدا لە ٢٢ کەسدا کەسێک لە دانیشتوانی شاری نیویۆرک پێویستە جار جارە ببرێتە نەخۆشخانە ئەقڵیەکان، بۆیە

تەندروستییە ئەقڵیەکان بە گەورترین گرفتی ئەم سەردەمە دانراوە، هەروەها مەترسیدارترین نەخۆشین بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشییەکانی دڵ و تاعون و کولێرا و شێربەنجە. دوای زیادبوونی نەخۆشیە جەستەییەکان بەهۆی تێکچوونی دۆخە دەروونیەکانەوە، زانستی پزیشکی ناچارکرا دەستبەرداری بناغە فەلسەفییەکەی بێت کە جیاوازی دەکرد لەنێوان "جەستە و دەروون" یان "کاریگەری دەروون لەسەر جەستە"، ئەمە بووە هۆی دەرکەوتنی پزیشکی دەروونی وەک قەرەبووکردنەوەیەک بۆ بابەتەکە و گەڕانەوەی هاوسەنگی نێوان دەروون و جەستە لە ڕووی کاریگەریەوە.

لەم پێوەدانگەیەوە ئەم بابەتە لەوە زیاتر تەشەنەیکرد، بەوەی کە روحی مەعنەوی کاریگەری هەیە لە چارەسەربوون و ئاینیش ڕۆڵ و کاریگەری خۆی هەیە، لێرەدا الکیس کارلیل دەڵێت: "لە زۆربەی شارەکان و سەردەمەکان، خەلکەکە باوەڕی بەوە هەبوو کە لە شوێنە پیرۆزەکان هیوای چاکبوونەوە هەیە و خەڵک چاکبووەتەوە، بەڵام لە سەدەی ١٩ بەدواوە زانست ئەو هیوایەی لەناوبرد و ئەوەی بە کارێکی مەحاڵ وەسفکرد، هەرچەندە تێبینیەکان لە ماوی ٥٠ساڵی ڕابردودا ئەو هەڵمەتەی زانستی لاوازکرد، بەوەی کە لایەنی روحی کاریگەری خۆی هەیە لە

چاکبوونەوەی نەخۆش. بۆ ئەمە دەبینین کارل یونگ دەڵێت: "ئایین فاکتەرێکی کاریگەر بووە لە چاکبوونەوەی نیوەی نەخۆشەکانی".



## بەشی دووەم

## لە نێوان پزیشکی یۆنانی و پزیشکی ئیسلامی - عەرەبیدا

### یەکەم: میسر کانگای دەرکەوتنی پزیشکی بووە:

١ - هەڵەی گەڕانەوەی سەرجەم زانستەکان بۆ یۆنان:

زۆربەی نووسەرانی ڕۆژئاوا ئاماژە بەوە دەکەن شارستانییەتی گریگ ڕووداوێکی ناوازە بووە لە بەرامبەر سەرجەم ئەوەی ڕۆژهەڵاتییەکان پێشکەشیانکردووە، بەنمونە "کیتو" دەڵێت: "هەرچەندە شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵات لە ڕووی کردارییەوە زۆر لە پێش بوونە، بەڵام لە ڕووی ئەقڵیەوە نەزۆک بوونە، ملیونەها کەس لە پێش گریکییەکان ئەزموونی ژیانیان تاقیکردوەتەوە، چیان پێکرد؟ هیچ، ئەزموونی هەر نەوەیەک لەگەڵ مردنیان کۆتایی پێهات، بەڵام گریکییەکان تەنها ئەوان بوون کلتور و ئەدەب و فەلسەفە و هونەر و داستان و بیرکاری و چەندین زانستی تریان داهێنا.

هەروەها برتراند رەسڵ دەربارەی ئەمە دەڵێت: "لە هەموو مێژوودا شتێک نیە ئەوەندەی دەرکەوتنی لە ناکاوی شارستانیەت لە وڵاتی یۆنان سەرسوڕهێنەرتربێت، زۆرێک لە پێداویستییەکانی شارستانییەت لە

وڵاتانی میسر و عیراقی کۆن هەبوو، بەڵام نەبوونی هەندێ توخم ڕێگر بوو لەوەی پێش یۆنان بکەون. ئەوەی یۆنانییەکان لە بواری ئەقڵ بەرهەمیان هێنا شتێکی ناوازە بوو، ئەوان بیرکاری و فەلسەفە و زانستەکانیان داهێنا، ئەوان بوون یەکەم جار مێژوویان تۆمار کرد، تا سەردەمی نوێ کەسانێک هەبوون باسیان لە موعجیزەی " پەرجوو" یۆنانی دەکرد".

ئەمانە ئەو بۆچوونانە کە زیادەڕەوی زۆری تیایدا کراوە، من تەنها دوو ڕاستی دەخەمە ڕوو وەک وەڵامێک بۆ بۆچوونەکان:

یەکەم: شارستانیەتی یۆنانی دوای شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵات دەرکەوتووە، واتا لە دەرکەوتنی دواکەوتووە، سودی زۆریشی لەوان بینیوە، بەڵکو شارستانیەتی یۆنانی بە درێژایی مێژووەکەی بەهۆی گەشتکردنی گەورە بیرمەندانیەوە لە شارستانیەتەکانی دەوروبەری ڕەگەزەکانی کلتورەکەی وەرگرتووە بەتایبەتی لە شارستانیەتی میسری، لێرەدا دەبینین فەیلەسووفی ئەڵمانی "هیگڵ" دەڵێت: "بناغە سەرەتاییەکانی

شارستانیەتی گریکی پەیووەندی هەبووە بە سەردانی کەسە نامۆکان بۆ وڵاتەکەیان، ئەوانیش سوپاسگوزاریان بوونە".

دووەم: نووسەرە ڕۆژئاواییەکان یۆنانیەکانیان گەیاندە ئەو ئاستە، خۆیان بەو جۆرە نەبوونە، بەڵکو ئەوان لەگەڵ هزری کەسانی تر هاوسۆز بوونە و تا ڕادەیەک ئایینیان لێوەرگرتون، قوربانیان پێشکەش بە خواوەندە نەناسراوەکانی ئەو گەلانە کردووە، هەروەها بانگەشەی برایەتییان کردووە لە هەندێ ڕێبازە فەلسەفیەکانیان وەک فیساغورییەکان و ریواقییەکان.

٢- " دروستبوون و دەستپێکردنی پزیشکی" لە میسری کۆنەوە.

دوو دیاردە هێندەی مرۆڤ کۆنن ئەوانیش "ئایین و پزیشکی"، مرۆڤ لە ترسی دیاردە سروشتیەکان پەنای بۆ خواوەند بردوە، کە دروستکراوی ئەندێشەی خۆی بووە، بۆ خۆپاراستن لەو دیاردانە بیرۆکەی خواوەندی داهێناوە، بەڵام بۆ مانەوەی لە ژیان لە بەرامبەر درم و نەخۆشییەکان و ئازارەکان پەنای بۆ چارەسەرکردن بردوە، واتا لەگەڵ یەکەمناڵەی ئازاری مرۆڤ پزیشکی لە دایکبووە، چونکە پێویستی مرۆڤ بۆ چارەسەر کەمتر نەبووە لە پێویستی بە خۆراک. بەڵام چارەسەرکردنی ئەو سەردەمانە زیاتر

مۆرکی جادوی پێوە دیارە بووە، وەک چۆن نەزانینی بە یاسا سروشتییەکان و دیاردەکانی بووە پاڵنەرێک تا خواوەند و ئاینی داهێنا، بەهەمان شێوە نەزانینی بە هۆکارەکانی نەخۆشی بووە هۆی ئەوەی پەنا بۆ سیحر و فاڵ و جادوگەران ببات. بەڵام دەرکەوتنی ڕاستەقینەی پزیشکی لەوکاتەوە دەستیپێکرد کە خۆی لە دەستی سیحر و دەسەڵاتی ساحیران ڕزگارکرد، بۆیە میسر وەک وڵاتێک هەندێ بنەما و فاکتەر هەبوون وایلێکرد پزیشکی تیایدا دردەکەوێت و گەشەبکات لەوانە:

## أ- بنەما و کۆڵەکەکان:

١- داهێنانی نووسین: پێش قوناغی نووسین مەحاڵە زانستێک دروستبێت، مەرجە بۆ مانەوەی زانیارییەکان و گواستنەوەی بۆ نەوەکانی داهاتوو تۆماربکرێت، لێرەدا دەبینین "بوول غالیونجی" دەڵێت: "بە هۆی داهێنانی نووسینەوە توانا پزیشکییەکانی میسر بەئاکام گەیشت، هەروەها دۆزینەوەی کاغەزی بەردی هۆکارێکی تر بوو لە پاڵ داهێنانی نووسین بۆ دروستبوونی زانست، چونکە ئەم دروستبوونە مەحاڵە لە قۆناغی نەخشی سەر بەردەکان ڕوویداوە. لەلایەکی تر، دروستکردنی پێنوس وەک

بنەمایەکی تری پێویست بۆ دروستبوونی زانست ڕۆڵی هەبووە لە پاڵ داهێنانی نووسین و دۆزینەوەی کاغەزی بەردی.

گرنگی نووسین لە دروستبوونی پزیشکیدا لە دوو دۆخدا دەردەکەوێت ئەوانیش:

- وەسفە پزیشکییەکان: بریتیبوون لە تۆمارکردنی نەخۆشییەکان و چارەسەرە گونجاوەکان، "هاریز" دەڵێت: بۆ نووسینی وەسفە پزیشکییەکان و دەرمانەکان و کاریگەری هەر دەرمانێک لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان وەک سیمایەکی بنەڕەتی بۆ پزیشکی قەرزاری شارستانییەتی میسریەکانین.

- کۆمەڵە تابلۆیەکی پزیشکی: شوێنەوارناسەکان وێنە ڕەسەنەکانی بەشێک لە نووسینە پزیشکیکان بۆ سەدەی "٣٠ پ.ز" دەگەڕێننەوە، بەنمونە "بریستد" پێیوایە "نووسینی ئادوین سمیس" ڕەنگە بۆ "ئەمحوتبی "وەزیری پاشا "زوسر" لە بنەماڵەی سێیەم بگەڕێتەوە.

بەڵام مێژوونوس "مانتو" بۆچوونێکی تری هەیە، ئەو پێیوایە "اسوزیس" پاشای دووەمی بنەماڵەی یەکەم کاری پزیشکی کردبێ، چونکە نووسینی

تایبەت بە توێکاری هەبووە تا سەدەی "سێی پ.ز" لە بەردەستدا بووە. ناوبانگی میسر لە پزیشکی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تابلۆی نوسراو و تۆمارکراو تیایدا شێوازەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی تۆمار کردووە.

لێرەدا دەبینین "هومیروس" ناوبانگی میسرییەکانی لە بواری پزیشکی بۆ فاکتەر گەڕاندۆتەوە ئەوانیش:

**یەکەم:** پزیشکی بە توانا و کارامە.

**دووەم:** کۆمەڵەی پزیشکی تیایدا شێوازەکانی چارەسەر و وەسفە پزیشکییکان تۆمارکراوە.

٢- ڕۆڵی دەسەڵاتی ناوەندی: دەوڵەتی میسری لە بواری پشتیوانیکردنی لە پزیشکی هاوتای نەبووە، چونکە میسر لە شارستانییەتە پێشینەکانە تیایدا دەسەڵاتی ناوەندی باڵا دەست بووە. لە بنەماڵەی یەکەمەوە هەندێ لە فیرعەونەکان کاری پزیشکیان ئەنجامداوە، هەروەها هەندێ لە پاشاکانیان هەڵگری نازناوی پزیشکی بوونە، بۆیە دەبینین لە

پێناو پتەوکردنی پەیوەندی سیاسی و دیبلوماسی لەسەر داوای پاشاکانی دەوڵەتە دراوسێیەکانی میسر، فیرعەونەکان پزیشکیان دەنارده ئەو وڵاتانە.

هەروەها چەندین پەیمانگای پزیشکی سەر بە پەرستگەکان هەبوون، کە خوێندکارانی بنەماڵە ناودارەکانی میسریان وەردەگرت. لە میسری کۆن، بناغە بۆ پزیشکی و چارەسەر دامەزرا و مووچەی پزیشکانیش دیاریکرا لەگەڵ پێدانی چەندین ئیمتیازاتی وەک " لێخۆشبوون لە باج "، بەڵام پیشەی پزیشکی تەنها مرۆیی بووە، بۆ هیچ مەبەستێیکی تر نەبووە، هەروەها بۆ سەرجەم گەلانی میسر بووە نەک تەنها بۆ بنەماڵە ناودارەکانی میسر. ڕەنگە ئەم ئاڕاستە مرۆییانەی دەوڵەت بەرامبەر بە خەڵکەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەوان لە دروستکردنی ئەهرامەکانی میسر هاوکاری دەوڵەت بوونە و هەرچی بەهۆی کارکردنەوە توشیان دەبوو، ئەرکی دەوڵەت بووە لە ڕووی تەندروستییەوە خزمەتیان بکات، بۆیە مێژوونوس "دیودور "دەڵێت: "زۆربەی میسرییەکان بێ بەرامبەر چارەسەر دەکران". بۆ ئەمە هەندێ لە بەردیەکانی "ئەدوین سیمس" .لە بواری نەشتەرگەری ئاماژە بەوە دەکەن کە هەندێ پێکانی شکاوی لە ئێسکەکان و کەڵەی

سەرەکان هەبووە ، ئەمە بۆ خۆی ئاماژەیە کە ئەوانە لە شوێنی بەرزەوە کەوتوونەتە خوارەوە.

لێرەدا بریستد دەڵێت: "چارەسەری شکاوییەکان زۆر سەرکەوتوو بوونە، چونکە دکتۆر "الیوت سیمس" پشکنینی بۆ زیاتر لە ١٠٠ لاشە کردووە، تەنها لە یەکێکیان نیشانەی گەناوی و هەڵاوسان هەبووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتوویی نەشتەرگەریەکانی بواری شکاوی.

٣- نەشتەرگەری: پێشکەوتووترین لقی پزیشکی بووە:

هەرچەندە هۆکاری نەخۆشییەکانی نەخۆش نایادر و ئاڵۆز بوونایە، ئەوەندە نەخۆشەکان پەنایان دەبردە بەر جادو و هێزە شاراوەکان وەک "نوشتەکردن"، ڕەنگە نەخۆشیە دەروونییەکان تا ئەمڕۆکە- زۆرترینی ئەو نەخۆشیانە بن کە لە دەستی جادو و دەسەڵاتی جادوگەران ڕزگاریان نەبووە. بە پێچەوانەوە ئەو نەخۆشیانەی هۆکارەکانی ڕوون و ئاشکران پێویستی بەوە نەدەکرد نەخۆشەکە بچێتە لای جادوگەران، لەو نەخۆشییانەی ڕزگاریان بوو لە دەسەڵاتی جادوگەران "سکبوون – ئازارەکانی ددان – ماندوبوونی منداڵبوون".

لە نێوان ٤٨ حاڵەتی نەخۆشی تۆمارکراو لە بەردەیەتی "ئەدوین سیمس" تەنها یەکێک لە پزیشکەکان پەنای بۆ جادو بردووە، حاڵەتەکان بەم شێوە ڕیزکراون "پێکان لە کەلەسەر- چەناگە - مل - شکان لە لاقەکان - دەموچاو". دوای پشکنین و دیاریکردنی جۆری پێکانە و شکاویەکە و کاریگەری لە ئەرکی ئەندامەکانی تری جەستە و پشکنین بۆ لێدانی دڵی نەخۆشەکە، لە کۆتاییدا پزیشکەکە ڕاپۆرتی خۆی لەسەر بابەتەکە لە سێ بڕیاردا دەنوسێ وەک "چارەسەر دەکرێ - دڵنیانیم، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم - شیاوی چارەسەرکردن نییە". واتا بە پێی ئەمە بێت دەتوانین بڵێین بەردەیەتی "ئەدوین سیمس" پەردە لەسەر کۆنترین ئەقڵی زانستی ئاوەلا دەکات لە مێژوودا". وە لە هەندێ حاڵەتی تردا، بەڵگەکانی ئەوە ئاشکرا دەکەن کە خودی پزیشکەکە لەگەڵ سوپا و سەربازکان بوو بێت لە جەنگەکاندا.

هەروەها نیشانەکانی منداڵبوون و سکبوون ڕوون و ئاشکران کە هیچ بوارێک بۆ ئەوە نەماوەتەوە باس لە کاریگەری هێزی شاراوە بکرێ، بەڵکو پزیشکەکە ئەوانەی لە ڕێگای نیشانە فسیۆلۆجیەکانەوە دیاریکردبوو، بە تایبەت لە ڕواڵەتی چاوەکان و مەمکەکانیان و پشکنینی میزەکانیان.

بەهەمان شێوە دەبینین کە پزیشکی ددان زۆر پێشکەوتوو بووە، چونکە نەخۆشیەکانی ددان زیاتر لە کۆمەڵگا دەوڵەمەنەکان و خۆشگوزەرانەکان زیاتر لەوەی لە کۆمەڵگا دەشتاییەکان هەیە، هەندێ لە بەردییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە نەشتەرگەری بۆ کیشان و پڕکردنەوە و چاندنی ددان کراوە، ئەمەش بەیەکەم نەشتەرگەری ددان لە مێژوودا دادەنرێت.

هەروەها ئەوان " پزیشکانی میسری کۆن" گەیشتن بە دیاریکردنی هەندێ لە نەخۆشیەکانی هەناوی وەک "شەکرە"، هەروەها گەیشتن بە زانینی نەخۆشیەکانی "چاو" وەک کوێربوونی شەوانە، کۆبوونەوەی ئاو لەسەر چاو"، لەو چارەسەرانەی بۆ نەخۆشی " کوێربوونی شەوانە" باسکراوە " خواردنی جگەری گا بووە”. دوای دانانی بناغە بۆ پزیشکی خۆماڵی، زۆربەی نەخۆشیەکان لە میسری کۆن ڕزگاریان بوو لە دەسەڵاتی جادو و جادوگەران.

٤- ڕۆڵی مۆمیاکردن لە پێشکەوتنی نەشتەرگەری و توێکاری.

میسرییە کۆنەکان لە مۆمیاکردن لاشەی مردووەکانیان پێشکەوتنی گەورەیان لە مێژوودا تۆمارکردووە، بەوەی ئەوان باوەڕیان بە مانەوەی

هەتاهەتایی هەبووە لە دوای مردن و گەڕانەوەی روح بۆ نێو جەستەیان. ئەم باوەڕە لە مۆمیاکردنی خواوەند "ئۆزویورس" لە لایەن خواوەند "آنوبیس" بووەتە باوەڕی میسرییەکان. هەرچەندە مۆمیاکردن ڕێورەسمێکی ئایینی پەتی بووە و لەلایەن کۆمەڵێک کەسانی ناپزیشک ئەنجام دەدرا، بەڵام بووە هۆی ئەوەی تاکی میسری زانەر بێت بە ئەندامەکانی نێو جەستەی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر. ئەگەر بیرۆکەی مۆمیاکردن لەسەر بناغەی وشکردن و پاکردنەوەی لاشەکە بووە لە ئاو بۆ ئەوەی بۆگەن نەکات یان تێک نەچێت، ئەوە بە هەمان شێوە نەشتەرگەریەکە کار لەسەر پاکردنەوەی برینەکە دەکات لە کێم و کرمەکانی.

بۆیە مۆمیاکردن لە زۆر لاوە لە توێکاری دەچێت، لە کردنەوەی سک و پارێزگاریکردن لە ئەندامەکانی ناوەوە بە تایبەت "دڵ" کە پێویستە بە ساغی و بێ تێکچوون بمینێتەوە، هەنگاوی دواتر دوورینەوەی پێستەکە و بەکارهێنانی پاککەرەوە و بەستەرە و لەفاف لە بەستنی شوێنەکە، بۆیە "بریستد" مۆمیاکەری بە لیهاتووترین پەرستار لە مێژوودا وەسفکردووە. هەروەها بۆ یەکەمجار لە مێژوودا وشەی "مێشک" وەسفکراوە و ئاماژە بە

هەندێ کاریگەریەکانی کراوە لەسەر جوڵەی ئەندامەکانی تری جەستە، ئەمە دوای هەزار ساڵ لە پزیشکی گریکی باسکراوە و ئاماژەی پێکراوە.

**ب- ڕواڵەتەکان "ڕواڵەتی":**

ئایا دەبێ ڕواڵەتەکانی ئەم پێشکەوتنە چی بێت؟ گرنگترین سیماکانی چین؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە پەنا دەبەین بۆ بەردیەکانی" نوسراوەکان" بواری پزیشکی.

١- دەرکەوتنی چارەسەری خۆماڵی: خاڵی دەستپێکردنی پزیشکی ڕێکخراو لە سەدەی نۆزدە لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نوسینە کوناکان"، لە ڕاستیدا بەشێک لەو بەردیانە بێ بەش نەبوون لە جادو و نوشتە و روقیە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە ئەوانە ڕۆڵیان لە چالاککردنی هیزی روحی ناوەوەی نەخۆشەکە هەبووە بۆئەوەی لە ئاست نەخۆشیەکە ورەی زیاتر بەرز بێتەوە ، چونکە ئەوانە وەک میژوونوسی پزیشکی "سیجرلیست" ئاماژەی بۆ دەکات ڕۆڵیان لە چاکبوونەوە هەبووە. بۆیە پێویستە جیاوازی بکرێ لە نێوان گەڕانەوەی نەخۆشیەکە بۆ هێزی خراپەکار و پەنا بردنە بەر شێوازی روحی لەپێناو بەخشینی ئارامی دەروونی بە نەخۆشیەکە، لێرەدا

دەبینین دکتور "حسن کمال" لە وەڵامدانەوی بۆ بۆچوونەکانی "بریستد" سەبارەت بە بەکارهێنانی نوشتە و روقیە تایبەت بە دیاردەی "سووتاوی – سووتان" لەوەی "بریستد" ئەم جۆرە کارانە بە ئەفسانە و خورافە وەسفکردووە و خاوەنی هیچ بەهایەک نیە، بەڵام وەڵامدانەوەکەی "د. حسن کمال" بریتیبوو لەوەی کە مەترسیدارترین حاڵەتی "سووتان" بریتییە لە "شۆکبوون"ی نەخۆشەکە لە ڕووی دەروونیەوە، ڕەنگە سووتانەکە ئەوەندەی شۆکبوونەکە مەترسی لەسەر نەخۆشەکە دروستنەکات، بۆیە ئەو کاتانەی پەنایان بردوە بۆ لایەنی روحی تەنها بۆ ئەوە بووە ئارامی بە نەخۆشەکە ببەخشن، چونکە زۆر هەڵەیە وا بیر بکرێتەوە لە دوای ئەبوقراتەوە پزیشکی لە خورافە و جادوگەری ڕزگاری بووە، بەوەی ئەبوقرات "گەشکە"ی گەڕاندۆتەوە بۆ هۆکاری فسیۆلۆجی و ڕەتکردنەوەی ئەوەی نەخۆشێکی پیرۆزبێت وەک ئەوەی لەناو خەڵکی باو بووە. بەڵام لەبەر نادیاری هۆکارەکانی نەخۆشیە دەروونیەکان دوا جۆری نەخۆشی بووە لە دەستی جادو و خورافات ڕزگاری بوو بێت، تا ئێستا لە زۆربەی کۆمەڵگاکان خەلکانێک دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو بۆچوونانەی

پێیوایە هێزێکی شاراوەی وەک "جنۆکە" دەستی لە نەخۆشیەکاندا هەیە و ئەوانیش پەنا بۆ جادو و فاڵگرەکان دەبەن.

لە لایەکی ترەوە، ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە دەڵێت: پزیشکی ڕێکخراو پشتی بە بنەمای "هەوڵدان و هەڵەکردن" بەستووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان، بەڵام ئەمە ڕاست نیە، ئەگەر وا بووایە ئەوە نەخۆشەکە لەناودەچوو تا چارەسەرەکەی بۆ دەدۆزرایەوە. لە ڕاستیدا ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە پزیشکەکان زانا بوونە بە تایبەتمەندی گژوگیاکان کە لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بەکاریان دەهێنا، چونکە ئەوە تەنها لە زانستی "کیمیاناسی و ڕووەکناسیەوە" دەبێ، بەنمونە کاتێک پزیشکەکە بۆ نەخۆشی "کوێربوونی شەوانە" داوا لە نەخۆشەکە دەکان "جگەری گا" بخوات، ئەو نازانێت کە نەخۆشەکە پێویستی بە "ڤیتاميناتە".

لێرەدا، ئەگەر ئاژەڵەکان بە غەریزەی خۆیان چارەسەری خۆیان دەکەن، وەک ئەوەی "حاجی لەق لەق" کاتێک لەشەڕکردندا بریندار دەبێت پەنا بۆ زەعتەر دەبات و لەسەر شوێنی برینەکە دای دەنێت "زەعتەر مێش دوور

دەخاتەوە"، ئەوە بۆ مرۆڤ لە پێشترە لە ڕێگای "سەرناسیەوە" ئاشنا بێت بە چارەسەرەکانی خۆی.

٢- دەرمانەکان: گرنگترین سیماکانی پزیشکی میسری لە دیدی "هاریزەوە" دەوڵەمەندیە لە "کۆمەڵەی دەرمانخانەکان"، چونکە زۆرترین تۆمارە بەردیەکان بۆ دەرمانە بە کارهێنراوەکانە، هەر لێرەوە گوازرایەوە بۆ دەق و تێکستی "عیبری- فارسی - یۆنانی - عەرەبیەکان"، بەڵکو لەوە زیاتریش گوازرایەوە بۆ نووسییەکانی هەر یەک لە "سیوفرایتس و دیوسقوریاس و جالینوس و ئەبوقرات"، بە نمونە "بەردی ئایبوورس" وەک سارچاوەی پزیشکی مایەوە تا سەدەکانی ناوەڕاست، لە کۆتاییدا بووە هۆی دانانی بەردی بناغەی زۆربەی چارەسەرە خۆماڵیەکان. لەوانە بەکارهێنانی "زەیتی خروع" و "هەنگوینی هەنگەکان" کە بۆ میسریە کۆنەکان دەگەڕێتەوە، هەروەها هەندێ لە وەسفە پزیشکیە قێزەوەنەکانی وەک "قوتدانی مشکی سورکراوە لەلایەن ئەو منداڵانەی گرفتی کۆکەیان هەبووە، ئەم جۆرە چارەسەرانە تا سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بەکارهێنراوە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان.

سەرچاوەی هەموو ئەو دەرمانانەش ڕووەکی و ئاژەڵی و کانزایین، لە نمونەی ڕووەکییەکان "میوەکان - سەوزەکان - دانەویڵەکان - بەهاراتەکان"، ئاژەڵیەکانیش لە دەریایی و وشکاوی پێکهاتبوون. بەڵام بۆ کەرەستەکانی بەهارات و عەتارەکان گرنگترینیان بریتیبووە لە "یەنسون" بۆ چەندین چارەسەر بەکار هاتووە لەوانە "خۆشکردنی تامی ناو دەم - بۆ دەرکردنی غازاتەکان". هەروەها "زەیتی خروعیان" وەک چارەسەری قەبزی منداڵان بەکارهاتووە، چونکە ڕەوان بووە، کە بۆ چەورکردنی برینەکان و لابردنی کەڕو سوودیان لێوەرگرتووە. ئاماژە بە سوودەکانی "زەعتەریش" کراوە ئەمەش وەک دژە بەلهاریزیا و کرمەکان بەکارهاتووە. لەتەک ئەوەشدا چەندین ڕووەکی تریان بەکارهێناوە بۆ چەندین چارەسەر لەوانە "جاترە - مێخەک - کەرەوز - زەردەچەوە - پاقلە - نیسک - نۆک - سیر و پیواز...هتد".

لەم پێوەدانگەیەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، لەهەموو سەردەم و ئایین و گەل و نەتەوە و شارستانیەتێک "دارێکی پیرۆز" هەبووە وەک شیفا و چارەسەر تەماشاکراوە و بووەتە سەرچاوەی چارەسەرکردنی زۆربەی نەخۆشیەکانی خەڵکی ئەو ناوچەیە. بە نمونە لە دوورگەی عەرەبی "دار

خورما " وەک داریکی پیرۆز و چارەسەر بۆ زۆربەی نەخۆشیەکان باسکراوە و چەندین ئایەت و فەرموودەش لەو بارەوە هاتووە. بە هەمان شێوە لە نوسراوە کۆنەکانی میسریشدا باسیکراوە و بۆ چەندین مەبەست بەکاریانهێناوە لەوانە دروستکردنی "مادەی بێهۆشکەر" پەنایان بۆ "عەرەقی خورما" بردوە و بۆ نەخۆشیەکانی میزڵدان و گەدە و ڕیخۆڵەکانیش بەکارهاتووە.

لە میسری کۆن ئەو دارەی زۆر پیرۆزە لای خەڵکەکە بریتیبووە لە داری "جمیز" ، وەک سیمبولێک لەلایەن میسر بەکارهاتووە، هەروەها لە دوارۆژدا "کاتی زیندوبوونەوە" تاکی میسری لە ژێر سێبەری ئەو دارە پشوو دەدات، بۆیە دەبینین کە "ئۆزویورس" لە تابووتێکدا نێشترا کە لە داری جمیز دروستکرا بوو. میسریەکان لە داری "جمیز" چەندین چارەسەری پزیشکیان بۆ نەخۆشیەکان دروستکردووە لەوانە "بۆ ڕەوانی و دژە هەوکردنی میزڵدان و چارەسەرکردنی هەندێ لە نەخۆشیەکانی پێست وەک ئەگەر سوودیان لێوەرگرتووە. دوای داری "جمیز" لە پیرۆزیدا "داری "الدوم" هاتووە، میسرییەکان سوودی زۆریان لێ بینیوە لە دروستکردنی بەشێک لە کەرەستەکانی ژیان وەک "پایەکانی پەرستگەکان - پێڵاوەکانیان

- ڕاخەری دانیشتنەکانیان"، تۆوەکەی بۆ ڕاگرتنی ددانەکان بەکارهاتووە و وەک شەرابێک بۆ سووتانەوەی میزڵدان و هەبوونی خوێن لە میزدا سوودیان لێوەرگرتووە.

پەیووەست بە میوەکان، دەبینین لای میسرییەکان "هەنار" وەک چارەسەر بۆ زۆر لە نەخۆشیەکان بەکارهاتووە، بە نمونە توێکڵی وشککراوی هەنار بۆ ڕاگرتنی سکچوون و لەناوبردنی کرمی ناو سک سوودیان لێ بینینوە، بۆیە دەبینین وێنەی دار هەنار لەسەر گۆڕەکانی "تل عەمارانە" لەسەردەمی "ئەخناتوونەوە" کێشراوە. هەروەها ئاماژە بە چەندین میوەی تر کراوە لەوانە "هەنجیر و ترێ و توو"، بە نمونە "هەنجیریان" وەک چارەسەر بۆ نەخۆشیەکانی جئگەر و سنگ و دژە بەلهاریزیا بەکارهێناوە، هەروەها بەدەر لە میسریەکان میوەی هەنجیر وەک یەکێک لە میوە پیرۆزەکان لێی ڕوانراوە، بەتایبەت لەناو گەلی موسلمانان، کە لە قورئاندا خودا سوێندی پێ خواردووە و یەکێک لە سورەتەکان لەژێر ناونیشانی (التين- هەنجیر) دابەزیووە.

**٣- بیردۆزی پزیشکی میسرییەکان:** سەرجەم تۆمارەکانی دەرمانەکان و چارەسەرەکانی نەخۆشییەکان بریتیین لە جێبەجێکردنی بیردۆزەکانی "نەخۆشیەکان - چارەسەرەکان - تەندروستی". واتا هیچ کارێکی پزیشکی بێ هەبوونی "بیردۆزەیەک" لە پشتیەوە کاری پێنەکراوە، بە نمونە لە یۆنانی کۆن فیساغۆرس کاری بە بیردۆزەی یان بیرۆکەی "تەندروستی بریتییە ،لە هاوسەنگی نێوان ئەندامەکانی جەستە و ژینگەی دەرەوە" کردووە، بەڵام لای هەریەک لە "ئەمبادۆکلیس و جالینوس" کار بە بیرۆکەی "نەخۆشی بریتییە لە نەمانی هاوسەنگی نێوان ڕەگەزەکان، واتا تەندروستی بریتییە لە گەڕانەوەی ئەو هاوسەنگیە بۆ نێوان ئەندامەکانی جەستە و ڕەگەزەکان و جیهانی دەرەوە" کردووە، ئەمە ئەرکی پزیشک بووە لە بیردۆزە یۆنانیەکان. ئایا بیردۆزە میسرییەکان لە بواری نەخۆشی و تەندروستی و چارەسەر چی بووە؟

لای میسرییەکان توێکاری ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە دەرکەوتنی پزیشکی بە تایبەتی نەشتەرگەری و سەربەخۆبوونی لە جادوویی، هەروەها توێکاری ڕۆڵی هەبووە لە بوونیادنانی بیردۆزی میسری سەبارەت بە

نەخۆشی و تەندروستی و دیاریکردنی چۆنیەتی چارەسەرکردن و ڕوونکردنەوەی نەخۆشییەکان. دەتوانین بڵێین مەبەستی توێکار دوورخستنەوەی لاشە بووە لە تێکچوون و لەناوچوون بەهۆی چەندین هۆکارەوە، بە هەمان شێوە پێویستە ئەرکی پزیشک خۆی ئەرکی پاککردنەوەی جەستە بێت لە هەموو ئەو مادەانەی دەبنە هۆی نەخۆشی.

لێرەوە توێکار بەو زانینە گەیشت کە یەکەم شوێن کەڕووی تێدا دروست دەبێ "ڕیخۆڵەکانە"، ئەمەش بەهۆی مانەوەی پیسایی تیایدا، بەڵام دوای وەرچەرخان لە جادووەوە بۆ پزیشکی "قۆناغی وەرچەرخان"، دەرکەوت کە سەرجەم ئیفرازاتەکانی "میز و پیسایی" دەبنە هۆی برین و بەرز بوونەوەی پلەکانی گەرما لەکاتی مانەوەیان لەناو ڕیخوڵەکان، بۆیە وشەی "ئەخدو" ئاماژەیە بۆ ئەو جۆرە مادانەی دەبنە هۆی نەخۆشیەکە، هەر کاتێک "ئەخدو" لە ڕیخوڵەکانەوە دزە بکاتە ناو خوێن، ئەوەش لە شێوەی شێربەنجە دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی جەڵتە. واتا ئەرک و پیشەی پزیشک لێرەدا ڕزگارکردنی جەستەیە لە "ئەخدو" بە پێدانی چارەسەری وەک "ڕەوان و پاککەرەوەی ڕیخوڵەکان"، بۆ ئەمە "هیرودوت" ئاماژە بەوە دەکات کە میسرییەکان سێ ڕۆژ لە مانگێکدا چارەسەریان وەردەگرت لە

شێوەی ڕەوان و خۆڕشاندنەوە و دەرزی لێدان لەڕێگای کۆم. ئەمانە بەشێک بوون لەو نەخۆشیانەی میسرییەکان چارەسەریان بۆ دیاریکردووە، بە تایبەت دەرکردنی خوێنی تێکچوو لەناو جەستە بە ڕێگای "کەڵەشاخەوە". بەو جۆرە خۆیان لە جەڵەتەکان دەپاراست. لێرەدا "هیرودوت" باس لەوە دەکات کە لە بیردۆزی میسرییەکاندا هاتووە، کە تیایدا سەرچاوەی نەخۆشیەکان بۆ زیادەڕویکردن لە خواردن و خواردەنەوە دەگەڕێتەوە، واتا زیاد لە پێویستی خۆی دەخوات، بۆیە نەخۆشییەکان بۆ ئەو زیاد لە پێویستیە دەگەڕێتەوە، کە دەبێتە هۆی ماندووکردنی گەدە و ڕیخوڵە و دڵ و جگەر.

٤- ڕۆڵی سینۆهە: قسەکردن لەسەر پزیشکی لە میسری کۆن بێ ئاماژە پێکردن بە کەسایەتی "سینۆهە" وەک پزیشکێکی ناوداری ئەو سەردەمە نیشانەی کەموکورتیە، وەک وەزیری پاشا "زوسر" لە بنەماڵەی سێیەم لە سەدەی سێی پێش زایین ناوی هاتووە، هەڵبەت کەسێکی زیرەک و لیهاتوو بووە لە سەرجەم بوارە زانستیە جیاوازەکاندا، لەتەک ئەوەشدا زانا بووە لە فەلەکناسی و ئەندازیاری و تەلارسازی، هەروەها ڕۆڵی هەبووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەردەمی قاتی بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە سەردەمی

پاشا "ئاموون هوتێبی سێیەم"، لە ڕووی کاریگەرییەوە سەرپەرشتی دیوانی پادشایەتی دەکرد و وەزیری دادیش بووە و دادگاکانی بەڕێوەدەبرد، لەگەڵ ئەوەشدا کاری پزیشکی خۆی کردووە و شارەزا بووە لە توێکاری و بنەماکانی نەشتەرگەری و شێوازەکانی چارەسەرکردن و ئامادەکردنی دەرمانەکان.

## نەسکی یەکەم: ئایا پزیشکی"ئیسلامی-عەرەبی" درێژەپێدەری "پزیشکی یۆنانیە"؟

پەیوەندی نێوان "فەلسەفە" و "پزیشکی" خاڵێکی سەرسوڕهێنەر دەوروژێنێت سەبارەت بە پەیوەندی نێوان "پزیشکی یۆنانی" و "پزیشکی ئیسلامی - عەرەبی". چونکە "پزیشکی" بە هەمان شێوەی فەلسەفە لە ئیسلامدا ڕێڕەویکی هاوتەریبی وەرگرتووە، بەوەی لە فەلسەفەی ئیسلامیدا سێ لق هەیە ئەوانیش:

یەکەم: فەلسەفەی ئەو فەیلەسووفە موسڵمانانەی، کە لە هێڵە گشتیەکاندا لە فەلسەفەی یۆنانی لاینەداوە، بەهەمان شێوە لە پزیشکیدا هیچ لادانێک نیە لە پزیشکی یۆنانیدا، بەنمونە پزیشکی لای هەریەک لە "ئەبوبکری ڕازی و ئیبن سینا و ئیبن روشد" لە بنەما فەلسەفیەکانیاندا

هەمان بنەمای فەلسەفی پزیشکی یۆنانیان وەرگرتووە، واتا هیچ لادانێک نییە لەم ڕووەوە.

دووەم: زانستی کەلام: لە زۆربەی بابەت و گرفتەکانی خۆی دوورە لە بابەت و گرفتەکانی فەلسەفەی یۆنانییەوە، واتا زانستی کەلامی ئیسلامی مۆرکی تایبەت و سەربەخۆی هەیە و هەڵقوڵاوی کیشە و گرفتەکانی ئەو سەردەمەیە، بە هەمان شێوە دەبینین لە بواری پزشکی ئیسلامیدا ڕەوتێک ڕێڕەوێکی تایبەت و جیاوازی لە فەلسەفەی یۆنانی دیاریکردووە بۆ کاری پزیشکی.

سێیەم: تەسەوف "سۆفیزم": دەوڵەمەندی لایەنی روحی و دەروونی سۆفیزمی ئیسلامی و خاڵی سەرەتا و هەنگاوی یەکەمی سۆفیزم بریتیبووە لە پاکردنەوەی دەروون و روح لەسەرجەم ئافات و نەخۆشیەکان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەشێک لە سۆفیەکان ڕۆڵیان هەبێت لە دەرکەوتنی پزیشکی ئیسلامیدا، بەوەی جۆرێک لە چارەسەریان دیاریکرد کە پێکهاتبووو لە تێکەڵەیەک لە هیدایەتی ئایینی و شیکردنەوەی دەروونی و هەڵسەنگاندنی ئاکاری.

## ڕەوتی یەکەم: پزیشکی ئیسلامی-عەرەبی بەشێکە لە پزیشکی یۆنانی:

لە وتەیەکی "ئیبن زەکریا "٣١٣"ەوە هاتووە: "هەر کاتێک ئەرستۆ و جالینوس لەسەر واتایەک کۆک بوون ئەوە ڕاست و دروستە، بە پێچەوانەوە ئەگەر ناکۆک بوون ئەوە مەحاڵە پەی بە ڕاستیەکە بەرین". ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بۆچوونی ڕەوتی یەکەم. هەر چەندە "ئەرستۆ" پزیشک نەبووە، بەڵام کوڕی پزیشکێک بووە، بەشێک لە بۆچوونە فەلسەفیەکانی بوونە بناغەی پزیشکی یۆنانی و لایەنگرانی ئەم ڕەوتە لەنێو پزیشکانی ئیسلامیدا. بۆیە زانست لای "ئەرستۆ" بریتییە لە ناسینەوەی علە"هۆکار"، هەر کاتێک هۆکاری شتەکانت زانی ئەوکات زانست گەڵاڵە دەبێ. هەروەها دەبینین کە "ئیبن سینا" هەمان بۆچوون دووبارەدەکاتەوە و دەڵێت: "زانست بە ناسینەوەی هۆکار و علەی شتەکان بە دەستدێت، بۆیە لە پزیشکدا پێویستە هۆکاری نەخۆشی و سەلامەتی بزانرێت، ڕەنگە هۆکارەکان دیاردەیی بن و بە تێبینیکردن بناسرێنەوە، وە ڕەنگە وا نەبێت هۆکارەکان نادیاربن و پێویستی بە قیاس و بەڵگەهێنانەوە و ئیستدلال"بەلگە" هەبێت بۆ ناسینەوەیان، کەواتە لە پزیشکدا زۆر گرنگ

و پێویستە نیشانەکان کە لە نەخۆشی و تەندروستی دەردەکەون بناسرێنەوە.

ئەمە خاڵی سەرەتای دەستپێکردنی پزیشکیە کە پزیشکە موسڵمانەکان لە بیردۆزی پزیشکی یۆنانیەوە وەریانگرتووە، واتا: "چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان لەسەر ناسینەوەی هۆکار و علەکانی ڕاوەستاوە". هۆکار و علەکانیش چوار جۆرن، کە بریتیین لە "مادی - بکەرێتی - ڕوخساری - مەبەستداری"، هۆکارە مادیەکانی پزیشکی بریتیین لە "شتە دانراوەکانی وەک ئەندامەکان کە بە هۆیانەوە نەخۆشی و تەندروستی ڕوودەدەن.

هۆکارە کارتێکراوەکانی پزیشکی بریتیین لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی وروژاندنی نەخۆشی و تەندروستی، وەک "هەوا" و ئەوانەی پەیوەندییان بە خواردن و خواردنەوەکان و شوێنەکان و شارەکان و دۆخەکانی نوستن و جیاوازەکانی تەمەن و ڕەگەز و نەرێت و پیشەکان هەیە، لەتەک سەرجەم ئەوانەی کاریگەریان هەیە لەسەر جەستە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کارتێکراوە، کارتێکراوەکە یان بە پێچەوانەوەی سروشتەوەیە "نەخۆشی" یان هاوسەنگە لەگەڵ سروشت "تەندروستی".

بەڵام بۆ هۆکارە ڕوخساریەکان و مەبەستدارەکان، بریتیین لە میزاج و پێکهاتەکانی تری ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤ، هەروەها مەبەستدارەکان بریتییە لە ناسینەوەی ئەو هێز و کردارانەی دەبنە هۆی تەندروستی جەستە، واتا ئەرکی پزیشکی پارێزگاریکردنە لە مانەوەی جەستە بە تەندروستی و لابردنی نەخۆشیەکان. ئەم تیۆرەی "ئەرستۆ" تەنها دەروازەیەک نیە بۆ پزیشکی، بەڵکو بە سەرجەم تیۆرە پزیشکیەکاندا بڵاودەبێتەوە، بۆیە بۆچوونە فەلسەفییەکانی "ئەرستۆ" تێکەڵ دەبێ بە بۆچوونە پزیشکییەکانی "جالینوس". بە نمونە دەبینین هۆکاری کارتێکراوی خوێن بریتییە لە هاوسەنگی پلەی گەرما، هۆکارە مادیەکەی هاوسەنگیە لە خۆراک و خواردنەوە باشەکان، هۆکارە ڕوخساریکەی گەشەکردنە، بەڵام هۆکارە مەبەستدارییەکەی خوێن بریتییە لە تێرکردن و پێدانی خۆراک بە جەستە.

لەم پێوەدانگەیەوە ئیبن سینا دەرک بەوە دەکات، کە زۆر بابەتی فەلسەفی هەیە تێکەڵ بە پزیشکی کراوە، بۆیە پێیوایە پزیشک پێویستە ئەوە بزانێت نەک وەک ئەوەی پزیشکە، بەڵکو وەک ئەوەی ئەوانە بابەتی سەلمێنراون لە زانستەکانی تر بۆئەوەی بنەما گشتیەکانی زانست گەشە بکات تا دەگاتە دانایی یەکەم کە پێی دەوترێت "میتافیزیک". هەروەها

دەرکی بەوە کردووە کە تیۆری تێکەڵەکانی جالینوس تیۆرێکی زانستی پزیشکی نییە، بەڵکو جالینوس وەک فەیلەسووفێک ئەوەی سەلماندوە کاتێک قسەی لەبارەی زانستی سروشتیەوە کردووە. لە پاڵ تیۆری چوار هۆکارەکە دەبینین ئیبن سینا سودی لە تیۆری "ناوەندی ئاڵتونی" ئەرستۆ وەرگرتووە بەوەی کە تەندروستی بریتییە لە بوونی هاوسەنگی نێوان هەردوو لای "زیادەڕەو" و "کەمڕەو".

لەگەڵ بوونی مۆرکی پزیشکی لە تیۆری تێکەڵەی چوارینەی جالینوس بەڵام هەر خاوەنی تایبەتمەندی فەلسەفیە کە بۆ فەیلەسووف "ئەمبادوقلیس" دەگەڕێتەوە ئەوانیش "ئاو و هەوا و ئاگر و گڵ". "ئاگر و هەوا" وەک دوو ڕەگەزی سووک و "ئاو و گڵ" وەک دوو ڕەگەزی قورس. بە نمونە "گڵ" پارچەیەکی سادەیە و شوێنی سروشتی خۆی دەکەوێتە ناوەندی گشتیەوە، "سارد و وشکە" ئەگەر هۆکارێک و کاریگەریەکی دەرەکی کاری لێنەکات، هەبوونی لە بوونەوەراندا بۆ یەکگرتن و جێگیری و مانەوەی شێوەکانە. بەڵام سەبارەت بە "ئاو" بەهەمان شێوە پارچەیەکی سادەیە، شوێنی سروشتی خۆی سەرجەمی زەوی لەخۆدەگرێ، "ئاو" بە سروشتی خۆی سارد و شێدارە، ئەگەر هۆکارێکی دەرەکی کاری

تێنەکات، سروشتی وایە هەموو شێوە و ڕوخسارێک دەگرێ. هەروەها "هەوا" پارچەیەکی سادەیە، شوێنی سروشتی خۆی یان لە سەرووی "ئاوەوەیە" یان لە ژێر "ئاگرەوە"، لە تایبەتمەندیەکانی "سووک و گەرم و شێدار"، هەبوونی لە بوونەوەراندا بۆ جوڵە و سوکی و نەرمییە.

کۆتا ڕەگەز "ئاگرە" ئەویش بریتییە لە پارچەیەکی سادە و شوێنی سروشتی خۆی لە سەرووی هەموو ڕەگەزەکانی ترەوەیە، واتا شوێنەکەی "سەرەوەی فەلەکی چەماوە، کە جیهانی بوون و تێکچوون دەکەوێتە کۆتاییەوە. لە سروشتی ئاگر "ئەگەر و وشک"، هەبوونی لە بوونەوەراندا بۆ گەشەکردن و تێکەڵبوونە.

لێرەدا دوای باسکردنی ئەم دابەشکارییە، دەبینین کە جەستەی مرۆڤ لەو چوار ڕەگەزە پێکهاتووە، خەسڵەتەکانی ئەو ڕەگەزانەی تێدایە، ئەگەر ڕەگەزەکان بە باشی و هاوسەنگی تێکەڵ بن و یەکبگرن، ئەوە دۆخی تەندروستی بە مرۆڤ دەبەخشێت، بە پیچەوانەوە ناهاوسەنگی و نەخۆشی دروستدەبێت. بۆیە "ئەرستۆ" هەمان ئەم بیردۆزەی بۆ ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی شتەکان بەکارهێناوە، لەمەشیاندا فەیلەسووفانی

ئیسلامی شوێن "ئەرستۆ" کەوتن لە ڕوونکردنەوەیان بۆ پێکهاتەی شتەکان لە ڕووی فەلسەفییەوە وەک چۆن "ئەبوقرات" بۆ پزیشکی پەنای بۆ بردووە. واتا "ئیبن سینا" چۆن لە دروستکردنی پەیوەندی نێوان کلتوری یۆنانی و کلتوری ئیسلامی سەرکەوتوو بووە، بە هەمان شێوە لە پزیشکیدا سەرکەوتوو بووە، بە نمونە قسەکانی دەربارەی "ئاو" دەڵێت: "هەموو شتێکی زیندوو بناغەکەی "ئاو"ە. ئەمە هەمان بۆچوونی "تالیسە" کاتێ وتی "ئاو سەرچاوەی ژیانە"، بێگومان "ئیبن سینا" هەمان بۆچوونی لە دەقی قورئانەوە هێناوە "وجعلنا من الماء کل شی حی". لێرەدا "ئیبن سینا" خۆی لە هزری یۆنانی دەپارێزیت بەوەی کە ئاڕاستەیەکی عیلمانیە و ناکۆکە لەگەڵ جەوهەری ئایینی ئیسلامدا، بۆیە دەستکاری بۆچوونی ئەرستۆ دەکات کاتێ دەڵێت: "سروشت هیچ کارێکی نارێک ناکات و دواجار باشی کاتەوە"، چونکە "خودا"ی بەدیهێنەر ئەوەی شیاوە بە بوونەوەرانی بەخشییەوە و بۆیان گونجاو و چاکە.

ئەگەر ئێمە لە "ئەرستۆوە بەرەو جالینوس" بڕۆین، ئەوە لە تیۆری چوار هۆکارەکەوە دەڕۆین بۆ تیۆری میزاجەکان، "میزاج" بە پێی پێناسەی "ئیبن سینا: بریتییە لە دروستبوونی چۆنیەتێک(تایبەتمەندیەک) لە کارلێکردنی

نێوان تایبەتمەندیە دژیەکەکان، ئەگەر لە یەکگرتنیان تایبەتمەندیەک دروستبوو ئەوە "میزاجە"، هەروەها ئەگەر هاتوو ڕێژەی یەکگرتنەکە هاوسەنگ بوو ئەوە میزاجێکی هاوسەنگ دروستدەبێ، بە پێچەوانەوە ئەگەر بەلای یەکێک لە تایبەتمەندییە دژیەکەکان بشکێتەوە "لە نێوان گەرمی و ساردی" و "وشکی و شێداری" ئەوە میزاجی ناتەندروستی لێ دەکەوێتەوە. واتا ئەندامەکانی جەستە لە تایبەتمەندی و چۆنیەتیەکان لێک ناچن "هاوشێوە نین"، ئێمە ئەندامی "ئەگەرمان هەیە وەک "دڵ" و ئەندامی ساردمان هەیە وەک "دەماغ" و ئەندامی شێدارمان هەیە وەک "جگەر" و ئەندامی وشکمان هەیە وەک "ئێسکەکان"، هەموو ئەمانە بە جۆرێک دروستکراون لەگەڵ کردە و کارلێککردنیان بگونجین، ئەمەش حیکمەتی "بەدیهێنەرە" بۆ بوونەوەران. گەرمترین ئەندام لە جەستەدا "روح و دڵە" دواجار "خوێن" بە هۆی پەیوەندی بە "دڵەوە"، دوای ئەو "جگەر و سییەکان و گۆشت و ماسولکەکان". بەڵام بۆ ساردترین ئەندامی ناو جەستە لە "بەڵغەمەوە دەستپێدەکا بەرەو پێو و گۆشت و مووەکان و بەستەرەکان و نوخاع و دەماغ و پێست". هەروەها ئەندامە شێدارەکانی ناو جەستە بریتیین لە "بەڵغەم و خوێن و پێو و دەماغ و نوخاع و گۆشتی

سینگ و جگەر و سییەکان و گورچیلەکان و ماسولکەکان و پێستەکان. بەڵام وشکترین ئەندامەکانی ناو جەستە بریتیین لە "مووەکان و ئێسکەکان و بەستەرەکان و وەتەرەکان و شەراینەکان، هەموو ئەمانە لە "جالینوسەوە" فێربووووینە.

هۆکاری ئەوەی سەرجەم مرۆڤەکان خاوەنی یەک جۆری "میزاج" نین بۆ ئەو دابەشکارییە دەگەڕێتەوە کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆکرد، بۆیە بە پێی شوێن و هەریمەکان میزاجەکانیش دەگۆڕێن، بە نمونە "هیندیەکان" میزاجی تایبەت بە خۆیان هەیە "هاوار دەکەن"، بەڵام خەڵکی "فارس" میزاجیان جیاوازترە و زیاتر "هاوسەنگن" لە ژیاندا، بۆیە ئەگەر کەسێکی هیندی بە میزاجی کەسێکی فارسی خۆی بگونجێنێت یان نەخۆش دەکەوێت یان بە هیلاک دەچێت، چونکە بۆ هەر یەکێک لەوانە ئاو و هەوای خۆی هەیە کە لەگەڵ میزاجەکەی دەگونجێت. هەروەها ئەم میزاجانە لە تەمەنە جیاوازەکانیش جیاوازن، لە منداڵدا جیاوازە وەک ئەوەی لە گەورەکاندایە، لە گەنجەکان جیاوازە بەراورد بە پیرەکان، لە نێرەکان جیاوازە بەراورد بە مێیەکان.

ئەم پێشەکییە زۆر گرنگە لەپێناو ڕونکردنەوەی نەخۆشیەکان و هۆکارەکانی و نیشانەکانی.

**نەخۆشی چیە؟**

نەخۆشی شێوەیەکی ناسروشتیە لەناو جەستەی مرۆڤدا، یان بە هۆی میزاجێکی ناسروشتیەوەیە یان پێکهاتەیەکی ناسروشتی. بۆیە "ئیبن سینا" لەگەڵ "ئەبوقرات" کۆکە لەسەر ئەوەی نەخۆشی لە ئەنجامی دۆخێکی ناسروشتیەوە ڕوودەدات، یەکەم جار دۆخەکە یان شێوە ناسروشتیەکە دواجار نەخۆشیەکە دەردەکەوێت، بەمە لەگەڵ "جالینوس" دژ بە یەکن، چونکە "جالینوس" پێیوایە نەخۆشیەکە پێش شێوە ناسروشتیەکە دەکەوێت، بەوەی کە دۆخە ناسروشتیەکە لە ئەنجامی نەخۆشیەکەوە دروست دەبێت.

**نیشانە چیە؟**

دۆخێکی ناسروشتیە، دوای نەخۆشیەکە دەکەوێت وەک "سوربوونەوەی ڕوومەت - تینوێتی و سەرئێشە" لەکاتی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای جەستە، نیشانەکان بۆ پزیشک وەک ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر

هەبوونی نەخۆشی و ناسینەوەی جەوهەری نەخۆشییەکە. هەندێ جار نەخۆشێک دەبێتە هۆی نەخۆشێکی تر وەک "کۆلۆن" کە دەبێتە هۆی "بوورانەوە"، وەک چۆن دەکرێ "نیشانە" ببێتە هۆی نەخۆشی لە نمونەی "ئازاری زۆر" دەبێتە هۆی "شێربەنجە"، هەروەها دەکرێ "نیشانە" خۆی نەخۆشی بێت وەک "سەرئێشە بە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای جەستە"، ئەمە ئەگەر جێگیربێت ڕەنگە ببێتە نەخۆشی.

بۆیە "جالینوس" باس لە سێ جۆر دۆخ دەکات بۆ جەستەی مرۆڤ، واتا دۆخەکانی جەستەی مرۆڤ لای "جالینوس" بریتیین لە: یەکەم ساغ و سەلامەتی"تەندروستی" جەستەی مرۆڤ لە شێوەی میزاج و پێکهاتەکانی کە بە تەواوی کار و چالاکی خۆی ئەنجامدەدات، واتا کردەکانی مرۆڤ ڕاست و دروستن. دووەمیان "نەخۆشی" کە پێچەوانەی ئەوەی سەرەوەیە، تیایدا کردەکانی مرۆڤ ناهاوسەنگە بەهۆی تێکچوونی میزاج و پێکهاتەکانی. سێیەم " دۆخێکە دەکەوێتە نێوان "ساغی و نەخۆشیەوە" وەک جەستەی پیاوە بە تەمەنەکان و گەورەکان، یان بە هۆی هەبوونی هەردوو حاڵەتی یەکەم و دووەم لە جەستەی مرۆڤدا لە یەک کاتدا، وەک ئەو کەسەی لە میزاجدا تەندروستە، بەڵام لە پێکهاتەیدا

ناساغە، یان وەک ئەو کەسانەی لە زستان ساغ و تەندروستن و لە هاوێن ناساغ و نەخۆش.

لێرەدا "جالینوس" دەڵێت: "تەخۆشیەکان سێ جۆرن، یەکەمیان ئەو نەخۆشیانەی دیارن و بە هەستەکان هەستیان پێدەکەین، دووەمیان ئەوانەی شاراوەن یان ناخەکین بە ئاسانی دەناسرێنەوە وەک هەبوونی ئازار لە گەدە و سیەکان و بۆڕی هەناسەدان، سێیەمیان ئەوانەن کە هەستیان پێناکرێ و ناناسرێن تەنها بە مەزەنە دیاریدەکرێن وەک ئافاتەکانی میزەڵدان.

هەروەها باس لەوە دەکات کە نەخۆشییەکان هەندێکیان "سادەن و هەندێکیان لێکدراو"، نەخۆشییە سادەکان یەک جۆرن یان میزاجی یان بە هۆی پێکهاتەوە، واتا دەکرێ کەسەکە بەهۆی تێکچوونی لایەنی میزاجیەوە نەخۆش بکەوێت ، یان بە هۆی تێکچوونی لایەنی پێکهاتەوە، بەڵام نەخۆشیە لێکدراوەکان ئەوانەن کە هەردوو جۆرەکەی تێدا کۆدەبێتەوە. مەبەست لە نەخۆشیە "لێکدراوەکان" تەنها ئەوە نییە کە بە هۆی کۆبوونەوەی لایەنی میزاجی و پێکهاتەیی دروستدەبێ، بەڵکو ئەو نەخۆشیە ئەگەر کۆببێتەوە لە ئەنجامی کۆبوونەوەکەدا یەک نەخۆشی

دروستدەبێ وەک "شێربەنجە"، دەزانین کە شێربەنجەکان لەیەک کاتدا نەخۆشی میزاجی و پێکهاتەیین، چونکە بێ خراپبوونی میزاج "شێربەنجە" روونادات، هەروەها نەخۆشییەکە کار دەکاتە سەر تێکدانی شێوە و پێکهاتەی جەستەی نەخۆشەکە.

## ڕەوتی دووەم: بناغە کەلامیەکانی پزیشکی "عەرەبی-ئیسلامی":

لەم باسەدا نووسەر ئاماژەی بە هەندێ بابەت داوە بەلای ئێمەوە زۆر پەیوەندی بە فەلسەفەی پزیشکیەوە نییە، چونکە بابەتەکان تایبەتن بە گرفتە کەلامیەکان، ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمەگرنگە لە ڕەوتی دووەم بۆچوونی "ئیبن خەلدونە" لەسەر فەلسەفەی پزیشکی و تیشکمان خستۆتە سەر بۆچوونەکانی لە وەرگێڕانی ئەم ڕەوتە.

١- "ئیبن خەلدون" وەک زانا و بیرمەند و فەیلەسووف و مێژوونوس، لەو بەشەی بۆ قسەکردن لەسەر پزیشکی تەرخانی کردووە ئاماژە بەوە دەکات کە "ئەوەی بە ناوی پزیشکیەوە و لەژێر ناوی (پزیشکی نەبەوی) بۆ ئێمە گۆازراوەتەوە تەنها بریتییە لە "پزیشکی خۆماڵی - کۆچەریەکان" نەک پزیشکی نەبەوی. چونکە ئەوەی بە زاری "پێغەمبەرمان" هاتووە،

وەک کەسێکی عەرەبی ئەو قسانەی کردووە نەک وەک "نێردراوێک"، چونکە هاتنی ئەو بە مەبەستی ئاشناکردنی خەڵک بووە بە شەریعەت و بەرنامەی خودا واتا لایەنی "بیروباوەڕ"، کە زیاتر بایەخی پێدراوە لە ڕووی شەرعەوە، نەک بۆ ئەوەی فێری لایەنی پزیشکیمان کات. واتا ئەو "پێغەمبەر بووە نەک پزیشک". بە واتایەکی تر " ئەو ئەرکی گەیاندنی پەیامی خودا بووە بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ یەکتاپەرستی بگەڕێنەوە"، بەڵام بۆ کاروباری ژیانی ڕۆژانە، ئەوە خەڵکەکە خۆی باشتر دەزانێت چۆن و چی بکات، بە نموونە لە ڕووداوی "پیتاندنی دار خورماکان" دەردەکەوێت کە "پێغەمبەرمان" بۆ چی هاتووە. وەک وتراوە "انتم اعلم بامور دنیاکم" "ئێوە خۆتان باشتر لە کاروباری دونیاتان دەزانن"، ئەوەی مەبەستە لێرە ڕوونکرێتەوە ئەمەیە "ناکرێ ئەو قسە و باسانەی سەبارەت بە لایەنی پزیشکی وتراوە لە زاری پێغەمبەرەوە بکرێتە چوارچێوەی شەرع و ئایینی و پەیامی خودا، واتا ناکرێ وەک فەرموودە تەماشابکرێ"، ئەوە تەنها بۆ ئەزموون و نەریتە عەرەبیەکانی ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە یان بۆ نەریتی گەلانی تر. هەروەها باس لەوە دەکرێ کە ئاماژەی بۆ چارەسەرکردنی چەندین نەخۆشی جەستەیی کردووە لەوانە "سەرئێشە"، بەکارهێنانی

"خەنە و بەستنی سەر" وەک چارەسەر فەرمانی پێ کردووە، هەروەها نەخۆشی "زات الجنب" بە قستی دەریاریی و زەیت چارەسەرکراوە. لەوانە کە "پێغەمبەر" وەک چارەسەر بەکاریهێناوە "کەڵەشاخ" بووە، لە "تاوس ئیبن عەباس"ەوە دەگێڕنەوە کە "پێغەمبەر" " درودی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی " کەڵەشاخ بگرن و پارەی ئەو کەسە بدەن کەڵەشاختان بۆ دەکات"، فەرمووی: باشترین چارەسەر کە بیکەن کەڵەشاخە".

ئەوەی لێرەدا ڕوون و ئاشکرایە، فەرمانەکانی "پێغەمبەرمان" بە خۆچارەسەرکردن، بەشێک بووە لە نەریتی عەرەبی ئەو سەردەمە و ناکرێ زۆربەی ئەوانەی بە ناوی "پزیشکی نەبەویەوە" دەوترێ بخرێتە پاڵ فەرموودە و فەرمانی ئەو وەک "نێردراو"، بەڵکو وەک عادەتی هەموو گەلانی دونیا، عەرەبی ئەو سەردەمە چەندین چارەسەری بۆ نەخۆشییەکان بەکارهێناوە، چونکە لۆجیکی نیە بوترێت پێش هاتنی پێغەمبەر خەڵکی هیچیان لە بارەی نەخۆش و چارەسەرەکان نەدەزانی و بە هاتنی پێغەمبەر خەڵکەکە فێری ئەوە بوون خۆیان چارەسەر بکەن، بەڵکو ڕاستر وایە بڵێین بەشێک لە فەرمانەکانی پێغەمبەر وەک لایەنی ئیمانی تەماشکراوە و کاریگەری هەبووە و سودی بە خەڵکەکە گەیاندوە و دواجار بە ناوی

"پزیشکی نەبەوی" بڵاوبووەتەوە. بە نمونە ڕۆژێک سەردانی نەخۆشێکی کرد و فەرمانی کرد بچن پزیشک بهێنن، وتیان تۆ وا دەڵێیت؟ "پێغەمبەری خودا" وتی: "بەڵی" خودا بۆ هەموو دەردێک دەرمانێکی داناوە یان چارەسەرێکی بۆ دیاریکردووە. ئەمانە و چەندین ڕووداوی تر بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر فەرمانی بە چارەسەرکردن داوە لە ڕێگای پزیشکەوە. بە نمونە پێوەدانی "دووپشک" و چارەسەرکردنی لە ڕێگای "ئاو و خوێ"وە، شوێنی پێوەدانەکە دەخرێتە ناو "ئاو و خوێ"وە.

٢- کەموکورتییەکانی ئەزموونی پزیشکی لای خەڵکی ناوچەکە "خەڵکی دورگەی عەرەبی" واتای ئەوە نیە پزیشکی لەگەڵ هاتنی ئیسلام بێ کەموکورتی نەبووە، چونکە پزیشکی لەو سەردەمە بە هەمان شێوەی پێشوو بە پشت بەستن بە بیردۆزێکی دیاریکراو کاری پێکراوە کە لە دەربڕینەکانی "حارسی کوری کلدە" هاتووە کە دەڵێت: "گەدەماڵی نەخۆشییەکانە"، "برسێتی یان کەمخۆری لوتکەی چارەسەرەکانە"، "سەرچاوەی هەموو نەخۆشیەک"البردە" واتا "خواردنی بەردەوام"ە، " کەسێک لەدوای یەک خواردن دەخوات بێ ئەوەی پشوویەک بە گەدە بدات”. لێرەدا "ئیبن خەلدون" دەڵێت: "سەرچاوەی هەموو نەخۆشیەکان

بریتییە لە خۆراکەکان.. چارەسەریش بریتییە لە ڕێجیمکردن، یان قەدەغەکردنی خواردن لە نەخۆشەکە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک و پێدانی خۆراکی گونجاو تا دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی. بۆیە "ئیبن خەلدون" جەخت لەوانە دەکاتەوە بە گەڕانەوەی بۆ دوو فاکتەر ئەوانیش "فسیۆلۆجی" و "مەدەنی".

- فاکتەری فسیۆلۆجی: لە ڕوونکردنەوەی ئەم فاکتەرە "ئیبن خەلدون" لە دەستپێکی خواردنەوە دەستپێدەکا، واتا پرۆسەی خواردن لە دەمەوە و بۆ هەرسکردنی لەناو گەدە و گەیشتنی بە جگەر، لێرەدا ئەگەر گەرمی جەستە لە کوڵاندنی خۆراک نەگاتە پلەی ئاسایی خۆی و لاواز بێت بە هۆی زۆربوونی خۆراک لەناو گەدە و زاڵبوونی بەسەر تواناکانی گەرمی جەستە لە ئەنجامدانی پرۆسەکانی خۆی وەک پێویست یان بە هۆی خواردنی خۆراکی تر پێش ئەوەی گەدە خۆراکەکانی پێشوتری هەرس کردەبێت، ئەوەی بۆ دەنێردرێت کە باش پێ نەگەیشتوە، ئەمانە لەناو گەدە و جگەر دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی بۆگەن دەبێ و کەڕوو دەگرێ، دواجار دەبێتە هۆی نەخۆش بوونی ئەندامێک لە ئەندامەکان، واتا

خۆراکی زۆر و لە ڕادە پێویستی مرۆڤ دەبێتە هۆی نەخۆشییەکان و نەخۆش بوونی مرۆڤەکان.

- فاکتەری شارستانیەت "مەدەنیەت": لێرەدا ئیبن خەلدون ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە زۆربەی ئەوانەی توشی نەخۆشی بوون، ئەوانە بوون کە خەڵکی شارەکان بوون بە بەراورد بە خەڵکی دەرەوەی شارەکان "دەشتایەکان - بیابانەکان"، هۆکارەکەی گەڕاندەوە بۆ زۆری جۆرەکانی خۆراک و مانەوەیان لەسەر یەک جۆری خواردن، و پیسبوونی هەوای شارەکان بە هۆی تێکەڵبوونی لەگەڵ هەڵمی پاشماوەکانی شتە فڕێدراوەکان، بەڵام بۆ خەڵکی کۆچەری کەمتر گرنگیان بە خواردنی زۆر دەدا و زیاتر برسێتی زاڵبووە بەسەریاندا تا وەک نەریتی لێهات، واتا ئەوان خۆیان لەسەر برسێتی ڕاهێنابوو و خواردنەکانیان سادە و کەم و گونجاو بووە لەگەڵ میزاج و پێکهاتەی جەستەیان، ئەمانە هۆکار بوونە بۆ ئەوەی کەمتر نەخۆش بکەون بەراورد بە خەڵکی ناو شارەکان، بێگومان پاکی و سافی ئاو و هەوای ناوچەکانیان کاریگەری هەبووە لەسەر تەندروستیان. خاڵێکی تر کە ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ کردووە بریتییە لە بوونی جوڵەی زۆر لەناو خەڵکە کۆچەریەکان بەهۆی وەرزشکردنی سوارچاکی و

ئەسپسواری و ڕاکردن و ڕاوکردن، ئەمانە هۆکار بوونە بۆ ئەوەی تەندروست بن و پێویستیان بە پزیشک نەبێت تەنها لە دۆخی زۆر پێویست نەبێت.

ئەم بیردۆزە پێچەوانەی بیردۆزی یۆنانیەکانی"بیردۆزی تێکەڵەکان یان میزاجەکان"ە، بەڵکو گونجاوە لەگەڵ بیردۆزی میسرییەکان بەوەی کە "نەخۆشی" دەگەڕێتەوە بۆ کەڵەکەبووی خواردنەکان لەناو گەدە، واتە پێش ئەوەی گەدە بە ئەرکی خۆی هەستێت ئێمە خواردنی تر ڕەوانەی ناو گەدە دەکەین. کاتێک پاشماوەکانی خواردن لەناو گەدە و ڕیخۆڵەکان دەمێنێتەوە دیاردەی کەڕوو و بۆگەنی و برین سەرهەڵدات و دەبێتە هۆی ئازار و نەخۆش بوونی کەسەکە، بۆیە باشترین چارەسەر و دەرمان لەم دۆخەدا "برسیبوون - کەم خواردنە". واتا فەلسەفەی "کەم خواردن یان گرتنەوەی خواردن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو" باشترین چارەسەر بووە کە بە ئەزموونی ژیان میسریەکان پێی گەیشتوون، ئەمە بە ڕوونی دوای هاتنی ئایینی ئیسلام دەردەکەوێت بە تایبەتی لە "فەریزەی ڕۆژوگرتن"، فەلسەفەی ڕۆژوگرتن بەشێکی بۆ چارەسەری جەستەیە لە نەخۆشییەکان و پاکردنەوەی گەدە و ڕیخۆڵەکانە وەک لە فەرموودەی ڕاست هاتووە "بە

ڕۆژوبن تەندروست دەبن". هەروەها لە چەندین فەرموودەی تردا هاتووە کە پێغەمبەری ئیسلام "محمد" "درودی خوای لەسەر بێ" ئاماژە بە گرنگی چۆنیەتی و چیەتی خواردن و خواردنەوە دەدات و چۆن مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ گەدە و خواردن و نەفسی خۆی بکات. لەوانە: "گەدە دەکرێتە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خواردن و بەشێکی بۆ ئاو و ئەویتر بۆ هەوا"، ئەم دابەشکردنە فەلسەفەی خۆی هەیە، هەر بەنمونە ئێمە دەتوانین بە ئەزموون و تاقیکردنەوە هەست بەو ئارامیە بکەین کاتێک گەدەمان دابەش دەکەین بۆ سێ بەشەکە، بە پێچەوانەوە، هەر کاتێک ئێمە گەدەمان تەنها بۆ خواردنەکە تەرخان کرد و هیچمان بۆ ئاو و هەوا نەهێشتەوە، ئەوکات زۆر هەست بە ناڕەحەتی و نائارامی دەکەین، ئەمە بۆ خۆی سەرچاوەی توش بوونە بە ئازار و دواتریش نەخۆشییەکان. هەروەها چەندین دەقی تر هەن ئاماژە بە گرنگی چۆنیەتی خواردن دەدەن لەوانە قسەیەکی "فوزیەلی کوری عەیاز" "پیاو چاکێک بووە" دەڵێت: 'سێ شت دەبنە هۆی دڵ ڕەقی: یەکێک لەوانە زۆر خواردنە". هەر بۆیە یەکێک لە نیشانەکانی ئیماندار "کەم خواردنە"، چونکە ئیماندار بەیەک "گەدە" نان دەخوات، بە پێچەوانەوە "کەسی بێباوەڕ" بە حەوت گەدەوە نان دەخوات"، مەبەست

لەم بۆچوونە ئەوە نیە کە بێباوەڕ حەوت گەدەی هەیە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەوانەی لە خواردندا بە ئەندازەی "حەوت کەس نان دەخۆن"، واتا لە نیشانەکانی ئیمان "کەم خواردنە". خاڵیکی تریش کە ئاماژەی بۆ کراوە سەبارەت بە خواردن، ئەوەیە "ئەو کەسانەی زۆر دەخۆن ئەوانەن کە ماڵی دونیایان خۆش دەوێ، ئەمە بۆ خۆی سەرچاوەی گوناهە و هەڵەکانی مرۆڤە لە دونیادا، بە پێچەوانەوە کەم خۆراکی نیشانەی "زوهد و داناییە لە ژیاندا" و سەرچاوەی دوورکەوتنەوەیە لە گوناهە و هەڵەکردن". دانایی ناچێتە ناو گەدەیەکی پڕ لە خواردنەوە". لێرەدا "عمری کوری خەتاب" دەڵێت: "وریابن لە گەدەتان، چونکە هۆکارە بۆ تێکچوونی جەستە و تووشبوون بە نەخۆشی و تەمبەڵی لە نوێژکردندا".

ئەمانە و چەندین هۆکاری تر هەبوونە کە "پێغەمبەر و هاوەڵانی و پیاوچاکان و سۆفیەکان، بەردەوام هانی خەڵکیان داوە خۆیان لە خواردن و خواردنەوەی زۆر بپارێزن. هیچ کات پەنا بۆ "قەدەغەکراوەکان" نەبەن تاوەکو وەک چارەسەر بۆ نەخۆشیەکان بەکاری بهێنن، چونکە "قەدەغەکراوەکان" چارەسەر نین، بەڵکو خۆیان نەخۆشی و دەردن. وەک ئەوەی دەوترێ "خواردنەوەی مادە کحولیەکان" بۆ چارەسەرکردنی

چەندین نەخۆشی بەسودە، لە ڕاستیدا وا نییە، چونکە لە فەرموودەکاندا ئاماژە بەوە کراوە: "خودا شیفا و چارەسەری ئیوەی لە مادە قەدەغەکراوەکاندا دانەناوە".

لێرەدا ئێمە لە بەردەم دوو تیۆرین لە پزیشکی و چارەسەردا ئەوانیش:

**یەکەم:** تیۆری یۆنانیەکان، کە بە "تیۆری تێکەڵەکان -میزاجەکان" ناسراوە، لەناو پزیشکە موسڵمانەکاندا "ئیبن سینا" بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بە کاریهێناوە.

**دووەم:** تیۆری" البردە و الحمیە" " لەرز و تا " بۆ میسریە کۆنەکان دەگەڕێتەوە، لە ناو موسڵمانان هەریەک لە "ئیبن قەیم و ئیبن کەسیر" بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان بە کاریانهێناوە.

یۆنانیەکان لە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان پشتیان بە "میتۆدی قیاسی" بەستووە، بە تایبەتی لە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی نەخۆشیەکان و تەندروستی بۆ بیرۆکەی "هاوسەنگی نێوان "پێکهاتەکانی جەستە" و "تێکچوونی ئەو هاوسەنگیە" دەگەڕانەوە، واتا زانین و زانیاریان بە هۆکارەکانی، هەروەها ڕاگرتنی هاوسەنگی خۆی بۆ خۆی زانین بووە بە

هۆکارەکانی تێکچوونی هاوسەنگییەکە. هەروەها پزیشکی یۆنانی زۆر کاریگەر بووە بە وتەکەی "ئەرستۆ" کە دەڵێت: "زانست بریتییە لە ناسینەوە و زانین بە علەکە- هوکارەکە"، واتا چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە پێویستی بە ناسین و زانینی هۆکارەکەیەتی.

بەڵام تیۆری میسریەکان زیاتر پشتی بە ئەزموون و تاقیکردنەوە و شارەزایی ژیانی ڕۆژانە بەستووە، واتە بێ دڵنیابوون لەوەی چارەسەرەکە بۆ نەخۆشییەکە گونجاوە پەنایان نەدەبرد بەر چارەسەرکردن، ئەمەیش پێویستی بە چاودێریکردنی وردی حاڵەت و دۆخەکان هەبووە.

میتۆدی ئەزموونگەراکان لە پزیشکیدا پشت بە چەند هەنگاوێک و قۆناغێک دەبەستێت لەوانە:

١- تێبینیکردنی پزیشکی بۆ تێکچوونی بار و دۆخ و ئەرکی نەخۆشەکە و چاودێریکردنی سەرجەم گۆڕانکاریەکانی قۆناغی نەخۆشییەکە، ئەمە یەکەم هەنگاوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکە.

٢- تێبینیکردنی سەرجەم ئەو ڕووداو و دۆخانەی تووشبووەکە دێتە پێشی وەک نیشانەی نەخۆشی لە کاتی جەنگەکان و بەربوونەوە لە

بەرزایەکان و ڕووداوی تر، واتا "تێبینیکردنی تێکچوونی ئەرکی ئەندامەکانی". چونکە جەنگەکان و دروستکردنی ئەهرامەکان و کەوتنەوەی ڕووداوی جوارجۆر دەوڵەمەندی لایەنی پزیشکی لێ کەوتەوە و بووە هۆی پێشکەوتنی کەرتی تەندروستی و پزیشکی لای میسریەکان.

٣- پزیشکی مومارس سودێکی زۆر لەو ئەزموونانە وەردەگرێ، بەڵام هەموو کات "مومارەسە و ئەزموون" بەس نیە بۆ چارەسەرکردن، بەڵکو "سەرناسی" ڕۆڵی گرنگی هەیە لە دۆزینەوەی ئاسوی چارەسەرەکان، ئەم سەرناسیە خەڵاتێکی خواییە کە بە مرۆڤەکان دەدرێت و بەم هۆیەوە پزیشکی پێشکەوتنی گەورەی بە خۆەوە بینی بەتایبەت لە دۆزینەوەی دەرمان و چارەسەرەکان.

٤- لە پاڵ ئەوانە "پزیشکی چارەسەرکەر" پشتی بە " قیاسی- پیوانەیی" "لێکچوو و هاوشێوە" بەستوە لە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان، وەک "بەکارهێنانی دەرمانێک لە نەخۆشێکەوە بۆ نەخۆشێکی تری هاوشێوە و لێکچوو" وەک بەکارهێنانی دەرمانەکانی چارەسەری دەستەکان بۆ

چارەسەری لاقەکان".

## ڕەوتی سێیەم: ڕۆڵی سۆفیزم لە پزیشکی دەروونیدا.

نەخۆشیە دەرونیەکان لە کۆنەوە تا ئێستا بە نەخۆشیە "هۆکار نادیارەکان" ناسراوە، بە مەترسیدارترین نەخۆشیەکان ناودەبرێت لە بەرامبەر نەخۆشیە جەستەییەکان، لەبەر نادیاری هۆکارەکانی و بۆ چارەسەربوون، نەخۆشەکە پەنای بۆ جادو و نوشتە و فاڵ بردوە. سەبارەت بە مەترسیەکانی دەبینین "الکیسس کاریل" دەڵێت: "نەخۆشیە ئەقڵیەکان لە نەخۆشیەکانی دڵ و کولێرا و تاعون و شێربەنجە مەترسیدارترن، نرخ و تێچووی ژیانی شارستانیەت و پێشکەوتنی پێشەسازی کە مرۆڤ وەک باج داوێتی بریتیبووە لە لاوازی ئەقڵی و شێتبوونیان".

چارەسەری نەخۆشیە ئەقڵیەکان بە درێژایی سەردەمەکان گەشە و پێشکەوتنی بە خۆوە بینیوە، لە کۆندا جادو و نوشتە کۆڵەکە و سەرچاوەی چارەسەر بووە، بە گەڕانەوەی نەخۆشیەکە بۆ هێزی نادیار و شەڕانگێز کە خۆی خزاندۆتە ناو جەستەی کەسەکەوە، بۆ دەرکردنی گیانە خراپەکان

پەنایان بۆ چەندین چارەسەر بردوە وەک ڕێوڕەسمەکان. هەرچەندە بۆچوونی "ئەبوقرات" مرۆڤی لەو بیروباوەڕە ڕزگارنەکرد، ئەبوقرات نەخۆشییە ئەقڵییەکان بۆ تێکچوونی فسیۆلۆجی دەگەڕاندەوە، بەڵام مرۆڤەکان هەر پەنایان دەبردە بەر جادوگەران بۆ چارەسەرکردنیان لە نەخۆشییەکان بە تایبەت بەکارهێنانی "نوشتە و روقیە" و شتی تر.

لەگەڵ گەشەکردن و پێشکەوتنی دیاردەی "خەوتنی موگناتیسی" لە سەدەی نوێدا، ئەوە جێگیربوو کە شیکردنەوەی دەروونی تاکە سەرچاوەیە بۆ ناسینەوەی نهێنیەکانی دەروون و کاری نەستەکانی مرۆڤ، ئەمەش بۆ ڕێگای چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونییەکان جێی متمانە بووە، بێگومان "شیکردنەوەی دەروونی" مۆرکی زانستی ئەو سەردەمەی هەڵگرتووە و دورخستنەوەی ڕۆڵی هەموو دیاردەیەکی نادیاری لە نەخۆشییەکە دوورخستەوە. لێرەوە قوتابخانەی شیکاری دەروونی گرنگی دا بە نەخۆشیە دەروونییەکانی وەک "خەمۆکی و فشار وشیزوفرینیا کەسایەتی"، وە بۆ ڕزگاربوون لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی و ڕاڕایی پێویستە لە "خۆبایی بوونی منی باڵا" کەمکرێتەوە. بۆیە قوتابخانەی "فروید" لە شیکاری دەروونی هیچی کەمتر نەبووە لە قوتابخانەی "کلود برنارد" لە پزیشکی

ئەزموونیدا. هەروەها پزیشکی دەروونی بیرۆکەکانی "فروید" لە شیکردنەوەی دەروونی تێپەڕاند، بە تایبەت دورخستنەوەی ڕۆڵی "ئایین" لەلایەن " روید"وە لە چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونیەکان. یەکەم کەس کە ئەمەی کرد "کارڵ یونگ" بوو کە دەڵێت: "لە ماوەی سی ساڵدا سەرجەم ئەو نەخۆشانەی ڕاوێژیان پێکردووە لە سەرانسەری جیهاندا، هۆکاری نەخۆشییەکانیان بۆ "لاوازی و کەمی باوەڕ و ئیمانیان" دەگەڕایەوە، تەنها دوای بەدەستهێنانەوەی "ئیمان و باوەڕەکانیان" لە نەخۆشیەکانیان ڕزگاریان بوو. هەروەها لە شوێنیکی تردا دەڵێت: "لە نێوان نەخۆشەکانم لە دوای (٤٠) ساڵییەوە، تەنها ئەوانە توشی نەخۆشیەکە بوونەوە کا ئیمان و باوەڕی ئایینیان لە دەستدایەوە و بە گەڕانەوەی ئەو ئیمانە جارێکی تر چاکبوونەوە". ئەمە بۆ خۆی گرنگی " لایەنی روحی و دەروونی ئیمان و باوەڕ" نیشاندەدات لە چارەسەربوون یان توشبوونی بە نەخۆشی دەروونی. بگرە گەڕانەوە بۆ لایەنی "ئیمان و باوەڕی ئایینی" لە زۆربەی جیهاندا وەک چارەسەر و ڕزگارکەر لە زۆربەی نەخۆشییە کوشندەکان ڕۆڵ و کاریگەری خۆی هەبووە، بە تایبەت لە نەخۆشییەکانی وەک "ئایدز" و کاریگەریە خراپ و مەترسیەکانی "مادە

هۆشبەرەکان" لەسەر دەروون و جەستەی مرۆڤەکان، هەروەها بەها ئایینی و ئاکارییەکانیان وەک سەرچاوەی چارەسەر و ڕزگاربوون لەو نەخۆشییانە باس کردووە.

بەم جۆرە دەبینین دیاردەی دووبەرەکی و جیابوونەوە لە ناو قوتابخانەی شیکاری دەروونی هەر بەردەوامە، لێرەدا "الکسیس" دەپرسێت : چۆن چارەسەری زۆربەی نەخۆشییە دەروونییەکان بە ڕێکەوت لە شوێن یان ڕۆژە پیرۆزەکان کراوە، ئەمە ناکرێ نکۆڵی یان پشتگوێ بخرێ؟

لێرەدا دەکرێ وەک وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارە بڵێم: وەک چۆن پزیشکی سەردەم پەنای بۆ سوود وەرگرتن لە پزیشکی کۆن بردووە ئەمەش وەک ڕازیبوون بە گرنگی تێڕوانینی گشتگەرا، بۆ نەخۆش، یان بۆ بوونی وزەیەکی زیندوو، کە کار بۆ دورخستنەوەی هەموو گیانێکی نامۆ و خراپ دەکات کە ڕوودەکاتە جەستەی مرۆڤ، بەهەمان شێوە دەبینین پزیشکی دەروونی سەردەم بۆ هەمان ڕاستی هەمان بۆچوون گەڕایەوە کە پێویابوو پەنا بردنە بەر ئایین و ئاکار لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان پێویستیەکی زەروریە.

یەکەم شت لە بواری هزری ئیسلامی سەبارەت بە پزیشکی دەروونی باس بکرێت، بریتییە لە ڕۆڵی فەیلەسووفانی کە لە بواری پزیشکی کاریان کردووە، نەخۆشییە دەروونییەکان بە ئەندازەی نەخۆشییە جەستەییەکان شوێنیان لەنێو کارکردن و گرنگیدانی پزیشکیدا نەبووە، ئەوان زیاتر پلاتۆنیانە تەماشای دەروونیان کردووە و نەخۆشی و ئافاتەکانیان بایەخ پێنەداوە. لە ڕاستیدا "کوڕی زەکریای ڕازی" باسی لە پزیشکی روحانی کردووە، مەبەستی ئەو "پزیشکی دەروونی بووە"، بەڵام هەندێ تێبینی لەسەر نووسینەکانی هەیە ئەوانیش بریتیین لە:

١- زیاتر باسی لە بابەتەکانی وەک "چەوسانەوەی نەفس و هەوا و توڕەبوون و درۆکردن و حەسودی و مەترسییەکانی عیشق" کردووە، واتا ئەو زیاتر بابەتە دەروونی و خوە خراپەکانی مرۆڤی تێکەڵ بەیەکتر کردووە، بۆیە "حەمید الدین الکرمانی" ڕەخنەی لێگرتووە و وتویەتی ئەو هیچ پەیوەندی بە پزیشکی دەروونیەوە نییە.

٢- سەبارەت بە دەروون زیاتر لە ڕووی فەلسەفییەوە باسیکردووە وەک ئەوەی لە ڕووی دەروونییەوە بێت، واتا باسەکانی ئەو پەیوەندیان

بە پزیشکی دەروونییەوە نییە، وەک قسەکەرێک وابووە لەسەر جۆرەکانی دەروون و چارەنوسی دەروون لە دوای مردن.

٣- ڕازی کتێبەکەی سەبارەت بە " پزیشکی دەروونی" بە وەسفکردنی "پێگەی ئەقڵ" دەستپێکردووە، بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی خۆی چارەسەربکات و پێویستی بە پزیشک نەبیت، بەڵام "حەمیدالدین کرمانی" ڕەخنەی لێدەگرێ، بەوەی کە پزیشکی دەروونی هاوشێوەی پزیشکی جەستەیی، تیایدا نەخۆش زۆر پێویستی بە پزیشک دەبێت بۆ ئەوەی چارەسەریبکات.

دوای بۆچوونی فەیلەسووفان، ڕۆڵی "سۆفیزم" وەک ڕەوتێکی روحی لە ئیسلامدا گرنگی خۆی هەبووە لە چارەسەرکردنی لایەنی روحی و دەروونی مرۆڤەکان، بەڵام بەهەمان شێوەی دیدە فەلسەفییەکەی ڕووبەڕووی ڕەخنە بووەتەوە. ئەوان لە پاکردنەوەی دەروون و روحی مرۆڤ ڕۆڵیان هەبووە، بەڵام لە چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان ڕۆڵیان نیە، بۆ وەڵامی ئەو قسانەی سەرەوە هەندێ ڕوونکردنەوە دەخەینە ڕوو تیایدا سۆفیزم ڕۆڵی هەیە لەوانە:

١- هەرچەندە هەندێ لە نەخۆشییە دەروونییەکان بە خراپەکاری دانانرێت، بەڵام لەگەڵ زۆربەی خراپەکاریەکان هەڵە تێگەیشتن دروستدەبێ، وەک "سادیە" بە هۆیەوە شەڕانگیزی ڕوودەدات، سایکوباتی و لامبالات و گەیشتن بە دیاردەی کوشتنی بێ پاساو،شیزوفرینیا کەسایەتی و گەیشتن بە حاڵەتی شێتبوون و دزیکردن.

٢- نەخۆشییە دەروونییە پەتیەکانی وەک "دوودڵی و ڕاڕایی و خەمۆکی"، تیایدا سۆفیزم ڕۆڵێکی بەڕەچاوی هەیە لە لەناوبردنیان، چونکە سۆفیزم بۆ پاکردنەوەی لە چڵکی دونیا و خەم و ناخۆشیەکانی ژیانی دەروون هەوڵدەدات.

٣- پزیشکی"سایکۆسۆماتیکی" "دەروونی جەستەیی" پەردە لەسەر زۆر لە فاکتەرە دەروونییەکان هەڵدەداتەوە وەک "خۆخۆیی" کە دەگاتە پلەی توشبوون بە هەندێ نەخۆشی جەستەیی وەک "ڕەبۆ و برینی گەدە". هەروەها هەڵچوونە دەروونیەکان مرۆڤ توشی پەستانی خوین و نەخۆشییەکانی دڵ دەکەن، لێرەدا سۆفیزم وا لە شوێنکەوتووەکانی دەکات کە چۆن موجاهەدەی نەفس و دەروونی خۆیان بکەن و شەڕ لەگەڵ حەز

و ئارەزووەکانی دونیا بکەن و مرۆڤ لەو فاکتەرانەی دەبنە هۆی وروژاندنی ئەم بابەتانە پاک بکاتەوە.

کەواتە خاڵی سەرەتا لە سۆفیزم وەک شێوازیک لە پزیشکی دەروونی ئەوەیە کە "ناخ کاریگەری لەسەر دەرەوە هەیە"، بۆیە سەرجەم کردەوەکانی مرۆڤ "چاک و خراپ" دەکەوێتە ژێر کاریگەری ترپەی دڵەکان و نهێنیە دەروونییەکان، ئەگەر دەروون چاک بوو ئەوە سەرجەم کردەوەکانی تری مرۆڤ چاک دەبن، بە پێچەوانەوە خراپ دەبن.

## تەسکی دووەم: ڕۆڵی سۆفیزم وەک بابەت و میتۆد لە چارەسەرکردنی دەروونی

**لە ڕووی میتۆدیەوە بەم جۆرە دەبێ:**

١-پەیووەندی نێوان "شێخ و دەرویش" پەیووەندییەکی روحیە و وەک پێویستییەک بۆ چارەسەر گرنگە.

٢-میتۆدی"چێژ"ی شێخەکە لە چارەسەرکردن.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، ئەو کەسەی مەبەستییەتی لە دونیادا لە تاوانەکان و خراپییەکانی دەروون خۆی پاککاتەوە، ئەوە پێویستە شێخێک هەبێت چاوساغی بکات و ڕێگای بۆ ڕوونکاتەوە، چونکە ناسینەوەی ئافاتەکانی دەروون پێویستی بە هەبوونی شێخێکی چاوکراوە و زانا هەیە بە دەروون و بوارەکانی دەروون، بۆیە دەروێش توانای ئەوەی نییە هەموو ئەو کارە بکات، بێ ئەوەی شێخێکی هەبێت، وەک دەڵێن "ئەوەی شێخی نەبێت ئەوە شەیتان شێخیەتی". لە ئەرکەکانی دەروێش نەشاردنەوەی نهێنیەکانیەتی بۆ شێخەکەی، واتا نابێ هیچ شتێک لە شێخی خۆی بشارێتەوە، پێویستە هەر چییەک بە دڵی دەروێشدا دێت شێخ بیزانێت، بۆیە پەیوندی نێوان "شێخ و دەروێش" وەک پەیووەندی نێوان "پزیشک و

نەخۆشە". چۆن نەخۆش هەموو شتێکی خۆی بۆ پزیشکەکە ئاشکرا دەکات وەک پێویستییەک بۆ چارەسەر، بە هەمان شێوە دەروێشیش نهێنیەکانی خۆی بۆ شێخەکەی ئاشکرا دەکات تا چارەسەری کات. لێرەدا پێویستە دەروێش خۆی بە تەواوی ڕادەستی شێخ بکات و ملکەچی هەموو فەرمان و بڕیارەکانی بێت و ناڕەزایی دەرنەبڕێ لە قسەکانی شێخ.

بەڵام ڕۆڵی سۆفیزم لە ڕووی بابەتەوە بۆ چارەسەری دەروونی خۆی لەمانەی خوارەوە دەبینێتەوە:

١- سەرەتا ئەو کاتەی کەسەکە تێکەڵ دەبێ بە ڕێگای سۆفیزم و دەبێتە دەروێش.

٢- گۆڕانی لەناکاوی دۆخەکانی هەندی لە کەسایەتییەکانی سۆفیزم.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، پێش هەموو شتێک پێویستە ئێمە دوو تێگە هەیە ڕوونی بکەینەوە ئەوانیش "ویست - دەروێش".

یەکەم: وەک چۆن خاڵی دەستپێکی هەموو کارێک و توێژینەوەیەک بە "من بیر دەکەمەوە" دەست پێدەکات، بەهەمان شێوەش خاڵی دەستپێکی هەموو ڕەفتارێکی کرداری بە بیرۆکەی "من دەمەوێت" دەست پێدەکات.

بەڵام "ویست - ارادە" لە دوو لایەنەوە واتاکەی لە هزری سۆفیزمدا زۆر جیاوازە لە واتاکانی لە هزری فەلسەفی و کەلامیدا، ئەوانیش:

١ - لەناوبردنی سەرجەم ویستەکان و ویستراوەکان و مانەوە لەسەر یەک ویستراو ئەویش "خودایە".

٢- گەیشتنی تێکۆشان بە بەرزترین لوتکەی وەک سوتانی دڵ بۆ مەعشوقەکەی، بۆیە پێناسەی "کاشانی" بۆ "ئیرادە" بریتییە لە: "پشکۆیەکە لە ئاگر لەناو دڵدا بۆ وەڵامدانەوەی ڕاستی".

لێرەدا بۆ لەناوبردنی ڕەگ و ڕیشەی شەڕانگێزی و خراپەکاری لە ناخی دەروون‌دا، سێ هێزی سەرەکی هاوکاری مرۆڤ دەکات ئەوانیش:

- هێزێکی خواوەندی باڵا کە پشتی تۆبەکار یان دەروێشی نەخۆش دەگرێت.

- شێخێکی ڕێنیشاندەر ڕۆڵی پزیشک دەگێڕێت.

- وزەیەکی زیندووی گڕگرتوو کە لە دڵدا ناکوژێتەوە تا ئامانجی خۆی بەدەستنەهێنێت ئەویش لەناوبردنی ڕەگ و ڕیشەی ئافاتە دەروونیەکانە.

لێرەوە و دوای ئەوەی واتای "ئیرادە" ڕونکرایەوە دەبینین واتای "دەروێش" دوو واتا لەخۆدەگرێ ئەوانیش:

- ئەو کەسەی سەرجەم ئیرادەی و ویستی خۆی واز لێهێناو خودای کردە تاکە بکەر.

- ئەوەی بڕیاردا و سور بوو لەسەر تەوبەکردن و بە جێهێشتنی تاوان و خراپەکاریەکان.

سۆفیزم لەسەر بنەمای "زاڵبوون بەسەر دەروون و نەفسدا" بوونیاد دەنرێت، واتا بە دابڕانی پەیوەندیەکان بە جیهانی دەرەوە و کاریگەریەکانی، لێرەدا دەبینین "ئەبکتیوس" دەڵێت: "ئەوە شتەکان نیە کە کار دەکاتە سەر مرۆڤەکە، ئەوە تێگەیشتن و بۆچوونی مرۆڤەکەیە کار دەکاتە سەری". بە نمونە ئەگەر "سۆکرات مردنی بە خراپە بزانیبا، ئەوە دەبووە ترسێک لە دڵیدا، بەڵام مردن لای ئەو بەو جۆرە نەبووو بۆیە پێشوازی لێکرد". بەم جۆرە ڕاو بۆچوونی خەڵکەکە کاردەکاتە سەر لایەنی دەروون و هەڵچوونەکانی. بە هەمان شێوەش لە "بودیزمدا" لەناوبردنی ئازار و خراپیەکانی ژیان بە لەناوبردنی "منێتی" دەبێ، تا مرۆڤ دەگاتە

بەرزترین پلەی ڕووناکی و ئارامی دەروونی و ئامادەی دەکات بۆ گەیشتن بە "نیرڤانا" واتە "لوتکەی بەختەوەری". هەروەها "دانای ریواقی" بەهەمان شێوە لە ڕێگای خۆ ڕزگارکردنی لە هەڵچوونەکانی دەروون دەگاتە بەختەوەری.

ئەو پرسیارەی لێرەدا دەکرێ بریتییە لە "سۆفیزم چۆن کار دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر دەروون و کۆنترۆڵکردنی هەڵچوونەکان و ڕزگاربوون لە نیگەرانی و ڕاڕاییەکان و سەرجەم هۆکارەکانی نەخۆشیە دەروونیەکان؟ سۆفیزم لەسەر بنەمای "زوهد -زاهیدبوون" لە دونیادا کاردەکات، دونیا لە چاوی ئەودا کۆتایی دێت و لەناودەچێت، بۆیە دەستبەرداربوون لێی ئاسانە، چونکە "خۆویستنی دونیا سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە". لێرەدا شێخ جونەیدی بەغدادی دەڵێت: "زوهد خاڵیبوونی دڵە لە هەموو تەماحێک".

ڕەنگە شیکاری دەروونی لەسەر ئەم بابەتە بۆچوونی جیاوازی هەبێت و لەگەڵ بۆچوونی سۆفیزمەکان کۆک نەبێت و دژبەیەک بن، ڕەنگە لای ئەوان سەرجەم ئەوەی باسکرا بە "نەخۆشی دەروونی" وەسفبکرێ، بەڵام

عیبرەتەکە ئەوە نیە، عیبرەتەکە بریتییە لەوەی تا چەند ئەوەی سۆفیزم باسیکردووە بە قازانج و سوود بۆ کەسەکە دەگەڕێتەوە، واتا لێرەدا بنەمای "پراگماتیکی" بۆچوونەکە و بابەتەکە یەکلایی دەکاتەوە. واتا هەر کاتێک چارەسەرەکە سوودی هەبوو ئەوە ڕاست و دروستە، بە پێچەوانەوە ئەگەر سوودی نەبووو ئەوە ناڕاست و ناتەندروستە.



# بەشی سێیەم

# فەلسەفە و ئاکاری پزیشکی

## تەسکی یەکەم: فەلسەفەی پزیشکی یان فەلسەفەی تەندروستی

بابەتی سەرەکی زانستی پزیشکی دوای تێبینیکردنی نیشانەکانی نەخۆشی پێویستە نەخۆشی نەخۆشەکە دەستنیشانکات، کار بۆ دۆزینەوەی گونجاوترین دەرمان بکات وەک چارەسەر بۆ نەخۆشییەکە. لەم پێناسەوە دەردەکەوێت پزیشکی هونەرە یان پیشەیە، بەڵام لە ڕاستیدا پزیشکی زانستێکی پراکتیکیە "هەم زانستە و هەم پراکتیکە". وەک هەموو زانستەکانی تری پزیشکی زانستە و بابەت و میتۆد و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە سەبارەت بە "نەخۆشی و تەندروستی و چارەسەرکردن". لەتەک ئەوەشدا زانستێکی تیۆریە، هەوڵدەدات لە جیهان تێبگات و بیگۆڕێت، جیهانی ئەم زانستە بریتییە لە "مرۆڤەکان"، "نەخۆشەکان یان ساغەکان"، کار بۆ ئەوە دەکات نەخۆشەکان چارەسەربکات و ساغەکانیش لە نەخۆشی بپارێزێت لە ڕێگای "خۆپارێزییەوە". سادەترین بەڵگە لەسەر ئەوەی کە "پزیشکی زانستێکی تیۆرییە" هەبوونی پەیوەندییە

بە زانستەکانی ترەوە وەک "فیزیا و کیمیا و بیۆلۆجیا و فسیۆلۆجیا و توێکاری". بەڵام زیاتر لە "زیندەوەرزانییەوە نزیکە" بۆیە ئایندە و چارەنووسی مرۆڤایەتی بەم پەیووەندیەوە بەستراوەتەوە، چونکە گرنگی زیندەوەرزانی لە کشتوکاڵدا هاوکارە بۆ دەستخستنی خوراک و ڕێگریکردن لە برسێتی و نەهێشتنی مەترسیەکانی پیسبوون و جۆرەکانی، پارێزگاریکردن لە مانەوەی هاوسەنگی بوونەوەرە زیندووەکان و جیناتەکان و چارەسەرکردنی لاوازەکان". لێرەدا زانستی پزیشکی سوود لە زیندەوەرزانی وەردەگرێ لە چۆنیەتی کارکردنی خانەکان و ئەندامەکان و پێکهاتەی خانەکان و یاساکانیان، ئەمە لە ڕووی تیۆرییەوە، بەڵام پزیشکی تەنها تیۆریی نییە بەڵکو لایەنی پراکتیکیشی هەیە، کە بریتییە لە " دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان، هەروەها شێوازە گونجاوەکانی خۆپارێزی و سەرکەوتن بە سەر نەخۆشییەکان و چۆنیەتی پاراستنی تەندروستی و هاوکاریکردنی نەخۆشەکان بۆ چارەسەربوونیان لە نەخۆشییەکان.

کەواتە پزیشکی وەک زانستێک میتۆدی تایبەت بە خۆی هەیە لە دەستنیشانکردنی دۆخەکان ئەویش بریتییە لە "نێوهێنجانە" "استقراء" کە

بریتییە لە: "دەرەنجامگیریی لۆژیکی لە تایبەتێتی یان تاکێتییەوە بەرەو گشتێتی- یاسایەتی – تیۆری". یەکەم زانست ئەم میتۆدەی بەکارهێنابێ لە زنجیرەی زانستەکان "فیزیایە"، واتا بە تێبینیکردن وەک هەنگاوی یەکەم دەستپێدەکات و بۆ گەیشتن بە دانانی گریمانەی زانستی و تاقیکردنەوەی گریمانەکان و گەیشتن بە چارەسەری گونجاو بۆ دیاردەکە، لەم کاتەدا چەندین گریمانە دەخرێنەڕوو و دەکەونە ژێر تاقیکردنەوەی ئەزموونییەوە و بێ توانایی گریمانەکان لە ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی دیاردەکە دەردەکەوێت و بە درۆ دەخرێتەوە و دوور دەخرێتەوە. بەڵام ئەو شێوازەی پزیشک لە میتۆدی "نێوهێنجانەوە" بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی نەخۆشەکە و دۆزینەوەی چارەسەر بەکاریدەهێنێت بریتییە لە: "بە ئەزموون و زانین و لیهاتوویی خۆی بەرامبەر بە نەخۆشەکە ڕادەوەستێت، گوێ لە قسەکانی دەگرێ کاتێک باس لە نەخۆشی خۆی و نیشانەکانی دەکات، دواجار پزیشکەکە زانیاریەکانی دەربارەی نەخۆشیەکە کۆدەکاتەوە و پشت بە ئەزموون و شارەزاییەکانی دەبەستێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی گشتی سەبارەت بە حاڵەتەکە گەلاڵە بکات ، ئەو کات بیر لە باشترین چارەسەر و شێوازەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە دەکاتەوە و لە کۆتاییدا دەگاتە

بڕیاردان لەسەر یەکێک لە چارەسەرە گونجاوەکان کە بۆ نەخۆشییەکە شیاو بێت". ئەوەی ڕوونە لێرەدا پیشەی پزیشکی مەترسیدارە بە تایبەت بۆ پزیشکە تازەکان "بڕیاردان لە سەر چارەسەری نەخۆشیەکە"، ڕەنگە پزیشکەکە لە وەسفکردنەکەی سەرکەوتوو بێت یان بە پێچەوانەوە شکست بهێنێت، لێرەدا پزیشکەکە پەنا بۆ میتۆدی "هەوڵدان و هەڵەکردن" دەبات و دەگاتە زانینی دروست بە دۆخەکە، واتا دوای چەندین هەوڵدان دەگاتە دیاریکردنێکی ڕاست و دروستی نەخۆشیەکە، ئەمە بۆ خۆی مەترسی زۆرە لەوەی کە پزیشکەکە سەرکەوتوو نەبێت و ببێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە.

دوای ئەم باسکردنەمان لەسەر زانستی پزیشکی و میتۆد و بابەتەکەی، ئێستا قسە لەسەر "فەلسەفەی پزیشکی یان تەندروستی" دەکەین. بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە پێویستە سەرەتا ئاماژە بە فەلسەفەی زانستەکان بدەین. لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان هەر زانست و فەلسەفەکەی، بۆ هەموو زانستێک بابەتی خۆی هەیە، بەڵام فەلسەفەکەی لەم تەوەرانە دەکۆڵێتەوە:

أ- دیاریکردن و ڕوونکردنەوەی واتای وشە و تێگە و زاراوە بنەڕەتیەکانی ئەم زانست و ئەو زانستە کە لە ڕاستیدا خودی زاناکان گرنگی بەم کارە نادەن، چونکە واتای تێگە و وشەکان بۆ ئەوان ڕوونە، بەڵام مەرجی ئەمە وایە، چونکە دەکرێ واتاکانیان ئاڵۆز و نادیار بن.

ب- تێڕوانینێکی شیکاری و ڕەخنەیی لە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی لەسەرجەم زانستەکان و پەرەسەندنی میتۆدەکان و دیاریکردنی لایەنی ئەرێنی و نەرێنی ئەم بابەتە، واتا گرنگیدان بە لایەنی میتۆدۆلۆجی و دیاریکردنی سنوری زانستەکان و میتۆد و بابەتەکانی زانستەکان، وەک ئەوەی لە فیزیادا دەڵێن ئەم زانستە سەرەتا بە میتۆدی استقراء "نێوهێنجان" دەستی بە لێکۆڵینەوەکانی کردووە لە تەماشاکردنی بابەتە بەشیەکانەوە بەرەو تیۆر و یاسا گشتیەکان، بەڵام لەگەڵ گەشەکردنی زانستی فیزیا و بەکارهێنانی زمانی سیمبوولی و هاوکێشە بیرکاریەکان لە پاڵ میتۆدی استقراء" نێوهێنجانە" هەر یەک لە هەڵهێنجان و ئیستنتاجی لۆجیکی وەک میتۆد بەکارهێناوە.

ج- تێڕوانینێکی شیکاری و ڕەخنەیی بۆ ئەو گریمانە و بیروباوەڕانەی زاناکان بێ قەید و مەرج متمانەیان پێیان هەبووە و وەک خۆیان وەریان گرتوە کە ڕەنگە لە بنەڕەتدا جیگای مشتومڕ بێت، وەک ئەوەی لە بنەمای "هۆ-ئەنجام" باوەڕمان بەوە هێناوە "هەموو ڕووداوێک هۆکارێکی هەیە" یان "هەموو ئەنجامێک هۆکاریکی لە پشتە" یان "لەوێدا ڕووداو هەیە بە ڕێکەوت ڕوودەدەن". هەروەها بنەمای "بەدوایەکداهاتنی ڕووداوەکانی جیهان"، واتا گریمانەی ئەوەی "ڕووداوەکانی داهاتووش هاوشێوەی ئەوانەی ڕابردوو و ئێستا ڕوودەدەن"، ئەم جۆرە بنەمایانە دەسەلاتی ڕەهای یاسا زانستیەکان و بنەمای حەتمیەت نیشاندەدەن، کە دەرچوون و لادان لێیان مەحاڵە.

دوای ئەم کورتە باسە لە فەلسەفەی زانستەکان، ئێستا قسە لەسەر "فەلسەفەی پزیشکی" دەکەین و دەپرسین مەبەست لە فەلسەفەی پزیشکی چیە؟ لە وەلامدا دەلێین : مەبەست لە فەلسەفەی پزیشکی بریتییە لە دیاریکردنی واتای وشە ناسراوەکانی لای هەریەک لە پزیشک و نەخۆش، چونکە ئەوان لایان وایە واتای وشەکان ڕوون و ئاشکران، بەلام کاتێک لە واتای وشەکان ورد دەبینەوە، دەبینین زۆر ئالۆز و ناڕوونن و پێناسەکردنیان

ئاسان نیە، لە نمونەی ئەو وشانە "تەندروستی، نەخۆشی"، واتا ئەو پێوەرە چیە بە هۆیەوە بڕیار دەدەین کەسێک نەخۆشە یان تەندروستە؟

لە مەبەستی دووەمی فەلسەفەی پزیشکی بریتییە لە پێویستی زانستی پزیشکی بە لایەنی ئاکار و بابەتە ئەخلاقیەکان، واتا هەبوونی بەشێک لە "ئاکاری پزیشکی - ئاکاری پیشەیی"، هەندێ جار بە "ئاکاری بیۆلۆجی" ناودەبرێت، لەم بەشەدا ئەو بابەتانە باسدەکرێن کە پزیشک لەکاتی کارکردندا ئاراستە دەکات" واتا لەکاتی چارەسەرکردنی نەخۆش و چۆنیەتی پەیوەندی نێوان پزیشک و نەخۆش". هەروەها بە دیدی رەخنەگرانە دەروانێتە بەکارهێنانی "تەکنەلۆجیای سەردەم" لە پزیشکیدا ئەو گرفتانەی لە ئەنجامی ئەو بەکارهێنانە دروستدەبن" گرفتی ئەخلاقی"، وەک ئەوەی لە بواری "هەندەسەی جینات و دەستکاریکردنی جینات و بابەتەکانی تری ئەم بوارە" ڕوودەدەن بە نمونە "خەون بە منداڵی داهاتووەوە" "سۆپەرمان" یان "سوپایەک لە مرۆڤی دەستکرد" یان "منداڵی بلوری"، ئەمانە هەمووی ئاماژەن بەو پێشکەوتنە لە بواری پزیشکیدا ڕوویداوە، بەڵام بێ گرفت و کێشەی ئەخلاقی هیچ کات ئەم پرۆسەیە تێپەڕنەبووە. لێرەدا چەندین پرسیاری ئەخلاقی دروست دەبن لەوانە "تا

چەند شیاوە دەستکاری جیناتی کەسەکان بکرێت؟ ئایا لەباربردنی کۆرپەلە ڕەوایە؟، ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر دەخرێنە ڕوو.

کۆتا مەبەست لە فەلسەفەی پزیشکی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی تەماشاکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆش بە تایبەتی و مرۆڤ بە گشتی، واتا ئێمە چۆن بڕوانینە ئەوان، وەک تەماشاکەر؟ ئەوان بۆ ئێمە واتای چی دەگەیەنێت؟ چۆن ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین؟ لێرەدا وا دیارە سەرجەم کۆمەڵە پزیشکیەکانی جیهان کۆکن لەسەر ئەوەی "مرۆڤانە" بڕوانینە نەخۆشەکان، پێویستە بە ڕێزەوە بڕوانینە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی زیندوو، بوونەوەرێک کە ژیانی پیرۆزە و ناکرێ وەک کاڵایەک ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ، خاوەن کەرامەت و عیزەتە و پێویستە پارێزگاری لێبکرێ و بە باشترین شێوە گرنگی بە لایەنی تەندروستی بدرێت، چونکە هیچ نرخێک بۆ ژیانی نیە. لێرەدا ئەو بابەتەی جێگای مشتومڕە بریتییە لە "مردنی لەسەرخۆ" "بۆ ئەوەی چیتر نەخۆشەکەیان بەدەست ئازارەوە نەناڵێنیت، ئەم بابەتە و مەرجەکانی یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی فەلسەفەی پزیشکی. چونکە لە لایەک پزیشک ملکەچە بەوەی لەسەرەوە باسمانکرد و لێرەدا ناچار دەکرێ بەوەی ئازاری نەخۆشەکە کەمکاتەوە، بەو کارەی دژی

بنەماکانی سەرەوەیە، واتا پزیشک لێرەدا دەکەوێتە نێوان پابەندبوون بەوەی سەرەوە و ڕزگارکردنی نەخۆشەکە لە ئازارەکانی بە تایبەت بۆ ئەو نەخۆشانەی کە چارەسەرکردنیان گەیشتوتە دۆخی بێ هیوایی. پرسیارەکە ئەمەیە "پزیشک چی بکات؟".

دوای ڕوونکردنەوەی واتاو مەبەست لە فەلسەفەی پزیشکی، ئێستا هەوڵدەدەین سێ بابەتی گرنگ پەیووەست بە فەلسەفەی پزیشکی باس بکەین ئەوانیش :

١- واتاکانی تەندروستی و نەخۆشی

کاتێک گوێبیستی کەسێک دەبێت قسە لەسەر تەندروستی دەکات، یان لە ڕۆژنامەیەک شتێک دەربارەی تەندروستی دەخوێنیتەوە یان لە پەرتووکێکدا بڕگەیەکت بەرچاو دەکەوێت لەسەر تەندروستی، وا دەزانێت ئەوەی بیستت و خوێندتەوە لێی تێگەیشتی، واتا لای خۆتەوە بە ئاسانی تێگەیشتنی خۆت بەیان دەکەی و دەڵی پێویستم بە فەرهەنگ و شارەزایەک نییە تا واتاکانیم بۆ ڕوونکاتەوە، ئەمە دۆخی هەمووانە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پێمانوایە لە واتاکانی تێگەیشتوین. بەڵام هەر کاتێک داوامان

لێبکرێ پێناسەیەک بۆ تەندروستی بکەین ئەوا ئاڵۆزی و قورسی پێناسەکردنەکە بۆ تەندروستی دەردەکەوێت و ئەو ئاسانی و سادەییەی پێشتر نامێنێت و پێناسەکردنەکە دەبێتە کێشە. ڕەنگە ئێمە هەوڵ بۆ پێناسەیەکی ڕەها و گشتگیر نەدەین، بەڵکو وا دەخوازێ ڕوونکردنەوە و پێناسەیەکی ئێکتیفا بکەین، لێرەدا ئاستەنگەکان بۆ گەیشتن بەو پێناسەیە دەردەکەون.

لێرەدا دەپرسین "تەندروستی چیە؟"، ئایا کاڵایەکە هەندێ جار هەمانە و هەندێ جاریش لە دەستی دەدەین؟ دۆخێکە سەرجەم ئەندامەکانی جەستەی خاوەنەکەی بە باشترین شێوە توانای ئەنجامدانی ئەرکەکانیانی هەیە؟ یان دۆخێکە وا لە خاوەنەکەی دەکات لەناو کۆمەڵەکەی خۆی بە باشترین شێوە چالاکیەکانی ئەنجام بدات؟ ئایا بریتییە لەوەی جەستە پارێزگاری لە مانەوەی تواناو هێز و چالاکی خۆی دەکات؟ تەندروستی بریتییە لە توانای خۆگونجاندن؟ یان تەندروستی بریتییە لە کۆی ئەوانەی باسمانکرد؟ لێرەدا زانایانی پزیشکی باس لەوە دەکەن کە ئەم پێناسانە لەگەڵ یەکتر ناکۆکن و ناتوانین لە هەموویانەوە واتایەکی گشتی بۆ تەندروستی دارێژین. ئەمە بۆ خۆی قەیرانێکە پزیشکان هەستیان پێکردووە

و بە پێویستی دەزانن ئەو دۆخە تێپەڕێنن، بۆیە دەگەنە ئەوەی کە زانستی پزیشکی پێویستی بە فەلسەفە هەیە، وەک هیوایەک بۆ ڕزگارکردنیان لەو قەیرانەی تایبەت بە تێگەی "تەندروستی".

ڕەنگە هەندێ لە پزیشکە ڕاهێنراوەکان بەوە سەرسام بن، کە زاناکان یان فەیلەسووفانی پزیشکی باس لەوە دەکەن، کە پێویستیان بە فەلسەفە هەیە، چونکە هەر یەک لە فەلسەفە و پزیشکی بابەتی تایبەت و سەربەخۆیان هەیە. بۆ ئەم مەبەستە گرنگە ئاماژە بە بەش و لقەکانی فەلسەفە بکەین لە ناویاندا "فەلسەفەی زانستەکان" و "ئاکارناسی" و "میتافیزیک" و "تیۆری زانین"، هەر یەک لەم لقانەی فەلسەفە بابەت و پرس و میتۆدی تایبەت بە خۆی هەیە لە وەڵامدانەوەی پرسیارە فەلسەفییەکان و گرفتەکانی. بەنمونە لە "تیۆری زانین" زیاتر ئەم پرس و پرسیارانە دەکرێن کە تایبەتن بە "زانین" و "سەرچاوەکانی زانین" و "سنوری زانین" و"سروشتی زانین" و "شیاوێتی بەدەستهێنانی زانین". فەیلەسووفان پرسیار دەکەن "ئایا بۆ گەیشتن بە زانین و بە دەستهێنانی پشت بە هەستەکان دەبەستین یان سەرچاوەیەکی تر هەیە بۆ زانین؟ ئایا زانین لە ڕێگای هەست و دەرکپێکردنی هەستیەوە زانینێکی ڕاست و

دروسته یان شیاوی گومان لێکردنه؟ ئایا سەرجەم زانینمان مسۆگەر و دڵنیاکەرەوەیە یان گریمانەیی و ئحیتمیالیە؟ ئایا سەرجەم زانینمان خودیە یان بابەتیە یان هەندێکیان خودین و ئەویتریان بابەتین؟ وە چەندین پرسیاری تر هەیە تایبەت بە زانین چیە و پەیوەندی بە باوەڕ و بۆچوون و ڕاستی و حەقیقەتەوە چیە؟ . سەرجەم ئەم لقانەی فەلسەفەی پزیشکی پەیوەندی لەگەڵدا هەیە، بە تایبەت فەلسەفەی زانستەکان، چونکە شیکردنەوەی واتا و پێناسەی تێگە و ووشەکان و ڕوونکردنەوەیان گرنگی خۆی بۆ زانا و پزیشکان هەیە وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. بەڵی ئەو وشانە سەرەتا وا دەردەکەون کە ڕوونن و تێگەیشتن لێیان ئاسانە، بەڵام دوای پرسیارکردن و هەوڵدان بۆ پێناسەکردنیان دەردەکەوێت چەند لێڵ و ئاڵۆز و ناڕوونن لە شێوەی وشەکانی وەک "دیموکراسی، دادگەری، ژیان، ئەقڵ، یەکسانی، بەهەمان شێوەش زاناکانی پزیشکی لە وشەکانی هەریەک لە "نەخۆشی و تەندروستی" هەمان لێڵی و ئاڵۆزی دەبینین و دەچنە خانەی ئەو وشانەی کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوە هەیە، لێرەوەیە پێویستی پزیشکی بۆ فەلسەفە دەردەکەوێت.

پێش ئەوەی قسە لەسەر بابەتەکانی فەیلەسووفانی پزیشکی بکەین، پێویستە ئاماژەیەک لەسەر بەشی "شیکردنەوە و پێناسەکردنی "تێگە و وشەکان بدەین و چۆن فەیلەسووفانی بە گرنگیەوە کاریان لەسەر کردووە بە تایبەت فەیلەسووفانی ئینگلیزی وەک "جۆرج مۆر - ١٨٧٣-١٩٥٨" و "برتراند راسڵ - ١٨٧٢-١٩٧٠" و فەیلەسووفی نەمساوی "لودوڤیچ ڤتگنشتاین- ١٨٨٩- ١٩٥١". ئەم فەیلەسووفانە لە ڕێگای میتۆدی"شیکارییەوە" کاریان لەسەر شیکردنەوەی واتای وشە و تێگەکان کردووە بۆ ئەوەی گرفت و کێشە فەلسەفیەکان ڕوونکەنەوە و لە ژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەدا ڕاستی و ناڕاستی و واتا و بێ واتاییان جیابکەنەوە. لێرەدا ڤتگنشتاین سەرنجی فەیلەسووفانی پزیشکی بەلای خویدا ڕاکێشا لەوەی کە جەوهەری فەلسەفە بریتی نییە لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تێگە و زاراوەکان کە فەیلەسووفانی بە درێژایی قۆناغەکانی فەلسەفە بەکاریانهێناوە. لە وتە و دەربڕینە ناودارەکانی ڤتگنشتاین: "فەلسەفە بریتی نییە لە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە"، "فەلسەفە کار لەسەر شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی لۆجیکی بیرۆکەکان دەکات"، "فەلسەفە بریتینیە لە کۆمەڵێک تیۆر، بەڵکو بریتییە لە چالاکی و چاودێری" هەروەها "فەلسەفە

بریتینیە لە کۆمەڵێک دەستەواژە، بەڵکو بریتییە لە ڕوونکردنەوەی دەستەواژەکان بۆ دیاریکردنی ڕاست و واتایان". واتا بەبێ فەلسەفە سەرجەم دەربڕین و دەستەواژەکانمان وەک ڕابردوو بە ئاڵۆزی و ناڕوونی داپۆشراوە، بۆیە ئەرکی فەلسەفە وا لەو بیرۆکە و دەستەواژانە بکات کە ڕوون و ئاشکرابن و سنوری نێوان واتا و بێ واتایان دیاریبکات. بە بۆچوونی "ڤتگنشتاین" ئەو زمانەی ڕۆژانە بەکاریدەهێنین پڕە لە کەمووکورتی و ناڕوونی، بەشێک لە وشەکان واتایەکی دیاریکراویان نیە، بەشێکی تریان واتاکانیان تێکەڵاوە، ئەویتریان بێ واتان، بۆ ئەوەی خۆمان لە سەرجەم کەمووکورتیەکانی بپارێزین "ڤتگنشتاین" پێشنیاری زمانێکی نمونەیی و دەستکرد "زمانی لۆجیکی" دەکات کە بۆ هەر وشەیەک تەنها یەک واتا هەیە و لە فرە واتایی و بێ واتایی دەمانپارێزێت. ئەم بۆچوونەی زیاتر لە کتێبی "تراکتاتوس" باسکردووە، بەڵام دواجار لە کتێبی "توێژینەوە فەلسەفیەکان" ڤتگنشتاین لەم بۆچوونەوەی پاشگەز دەبێتەوە و دیسانەوە باس لە بەکارهێنانی زمانی ڕۆژانە دەکات لە دەربڕینەکان و واتای وشەکانیش بە پێی چۆنیەتی بەکارهێنانیان دەگۆڕێت، ئەمەی ناونا "گەمەی زمان". بەم جۆرە وشەکان لە زمانی ئاسایی ڕۆژانەدا یەک واتایان

نیە بەڵکو زیاتر لە واتایەکیان هەیە ئەویش بەپێی لۆجیکی بەکارهێنان دەگۆڕێت. لێرەدا دەبینین بەشێک لە فەیلەسووفانی پزیشکی کاتێک کەوتنە ژێر کاریگەری فەلسەفەی ڤتگنشتاین، تەنها ئەم وتانەی "ڤتگنشتاین بوو کە سەرەنجی فەیلەسووفانی پزیشکی بەلای خویدا راکێشا" کە دەڵێت: "فەلسەفە بریتییە لە ڕوونکردنەوەی لۆجیکی بۆ بیرۆکەکانمان" وە "بۆ هەر وشەیەک یەک واتای هەیە" و "زمانی ئاسایی بکرێتە زمانی بیرکردنەوی زانستی" . لە دواجاردا ئەوەی فەیلەسووفانی پزیشکی لە فەلسەفەی "ڤتگنشتاین"وە وەریانگرت ئەمە بوو "فەلسەفە ئەو پرسیارانە لەخۆدەگرێ کە هەندێ پێیانوایە ڕوون و ئاشکران و پێویستیان بەوە نیە پرسیار دەربارەیان بکرێت"، بەڵام فەلسەفە خۆی چالاکی و کۆڵنەدانە لە پرسیارکردن و ڕوونکردنەوە، فەلسەفە ئەو پرسیارانە دەکات کە سەرەتا وەک پرسیاری سادە و منالانە دەر دەکەوێت" وەک ئەوەی بڵێین منداڵ ئەم پرسیارانە دەکات"، بەڵام فەلسەفە سورە لەسەر ئەوەی پرسیارەکانی دەربارەی ناڕوونی و نائاشکرایی واتای وشەکان بکات، ئەم ناڕوونیە وا لە فەیلەسووف دەکات کار بۆ ڕوونکردنەوەیان بکات، بەم جۆرە "ڕوونکردنەوە دەبێتە بنەمایەکی گرنگ بۆ تێگەیشتن. لێرەوە یەکەم

وانه که فەیلەسووفانی پزیشکی لە فەلسەفەوە فێری دەبن بریتییە لە: بە شیکردنەوە گرفتە گرنگەکان چارەسەر نابن، بەڵام شیکردنەوە هەنگاوێکی گرنگ و پێویستە لە هەنگاوەکانی تێگەیشتن.

زانا و فەیلەسووفانی پزیشکی دەرکیان بەوە کرد، کە ئاڕاستەی فەلسەفە لە سەدەی بیست سەبارەت بە دیاریکردنی واتای وشەکان و شیکردنەوەیان شتێکی تازە نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی "پلاتۆن – ٤٢٨-٣٤٨" لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن، بە تایبەت لە دیالۆگە سەرەتایەکانی وەک "کۆمار"، تیایدا هەڵوێستەکانی "سۆکراتی" مامۆستای تومارکردبوو. هەموو هەوڵ و تێکۆشانی لە کۆماردا بریتیبووە لە دیاریکردنی واتا و پێناسەی "دادگەری"، ئامانج و مەبەست لە هەڵبژاردنی ئەم وشەیە "دادگەری" بۆ خواستی هەندێ لە هاوریانی "سۆکرات" دەگەڕێتەوە کە خواستی ئەوەیان هەبووە ببنە سیاسەتمەدار لەناو دەوڵەتدا. گفتوگۆی "پلاتۆن یان سۆکرات" لەگەڵ خوێندکارەکانی زیاتر میتۆدی "نێوهێنجان – استقراء"ی بەکارهاتووە، لە دیاردەیەکی تاکییەوە دەستپێدەکا و هەنگاودەنێت بەرەو بڕیاردان یان داڕشتنی پێناسەیەک بۆ وشەکە وەک دەستپێکێک بۆ پەسەندکردنی یان ڕەتکردنەوەی و گەیشتن لە دواجاردا بە

پێناسەیەک لای هەمووان پەسەندکراو بێت. لەم پیوەدانگەیەوە ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە "پلاتۆن" لە گفتوگۆکانی دەربارەی "دادگەری" نەگەیشتن پێناسەیەکی گشتگیر، چونکە "پلاتۆن" ئامانجی ئەوە بووە کە گرنگی بە "شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە و ڕەخنەگرتن" بدرێت، ئەگەر نەگەینە پێناسەیەکی گشتگیریش سەبارەت بە پێناسەی بابەتەکە، گرنگ ئەوەیە ئێمە شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن وەک بنەمای گفتوگۆ پەسەند بکەین. با لێرەدا چەند بڕگەیەکی کتێبی کۆمار سەبارەت بە واتای "دادگەری" ڕوونکەینەوە، لە جیاتی ئەوەی پرسیار بکەین و بڵێین "دادگەری چیە؟" باشتر وایە پرسیار بکەین و بڵێین "کەسی دادگەر یان دادپەروەر کییە؟"، وەڵامەکە بەم جۆرە دەبێ "کەسی دادگەر ئەو کەسەیە ڕاستی دەڵێت و ئەمانەتیش دەگێڕێتەوە. بەڵام گریمانەی ئەوە بکە کەسێک چەکەکەی خۆی بە ئەمانەت دا بە تۆ، کاتێک داوای لێکردی ئەمانەتەکەی بۆ بگێڕیتەوە شێت ببوو، ئایا گەڕانەوەی چەکەکە بە کەسێکی شیت دادگەریە؟ وەڵامەکە: "نەخێرە"، واتا گەڕانەوەی ئەمانەت لە هەموو کاتێکدا بۆ خاوەنەکەی دادگەری نیە. ئایا دەڵێن "دادگەری" کردن چاکەیە لەگەڵ دۆستان و خراپەیە لەگەڵ ناحەزان؟ لێرەدا دەتوانین بڵێین: "مەرج

نیە هەموو دۆستانم چاکەخواز بن و هەموو ناحەزانم خراپەکار بن. ئایا واتای ئەمە دەکرێ بریتیبێت لە چاکەکردن لەگەڵ چاکەخوازان "چ لە دۆستان بن یان ناحەزان"، وەڵامەکە بە "نەخێر " دەبێت، چونکە چاکەکردن لەگەڵ ناحەزان بەهەموو شێوەیەک قەدەغکراوە. لە بڕگەیەکی تردا دەبینین "پلاتۆن" کار لەسەر پێناسەکردنی وشەی "دادگەر" دەکات لە ڕێگای پێناسەکردنی دژەکەیەوە "ستەمکار". وتنی درۆ یان دزیکردن یان فێڵکردن دەکەوێتە ژێر چەتری "ستەمکردنەوە"، بەڵام دۆخەکە چۆن دەبێت کاتێک "ناحەز" دەکەیت بە کۆیلە یان "فێڵ" لە ناحەز دەکەی. بەم جۆرە لە "پلاتۆن" تێ دەگەین کە پێویستە ئێمە پێناسەی وشە و تێگەکان بکەین هەرچەندە وا دەردەکەون کە ڕوون و ئاشکران و پێویستیان بە پێناسەکردن نیە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نیە. بۆیە گرنگی شیکردنەوەی واتا و پێناسەکردنی وشەکان بۆ ئەوەیە لایەنی پەیوەندیدار بە بابەتەکەوە بگەنە ڕێکەوتن لەسەر واتاکانیان، لەبەرئەوەی یەک واتای کۆنکرێتی نیە بۆ وشەکان و تێگەکان، بەڵکو واتاکان دەگۆڕین بەپێی قۆناغ و دۆخەکانی ژیان.

هەروەها فەیلەسووفانی پزیشکی لە فەلسەفەی فەیلەسووفی ئینگلیزی "فرانسیس بیکون " نمونەیەکی جوانیان بینی لە گرنگیدان بە دیاریکردنی

واتای وشەکان و ئاگاداربوون لەوەی وشەی نارِوون و ئاڵۆز و بێ واتا بەکار بهێنن. ناوی "بیکون" گرێدراوە بە میتۆدی زانستی "نێوهێنجان - استقراء" کە بە تەماشاکردن و ئەزموونکردنی رووداوەکان دەستپێدەکات و بە قۆناغی دانانی گریمانەکان و تاقیکردنەوەیان و گەیشتن بە چارەسەری گونجاو و دانانی تیۆر کۆتایی دێت" بەمە دەوترێت قۆناغەکانی میتۆدی زانستی، بۆ زانیاری زیاتر بروانە "لۆجیکی کۆن و هاوچەرخ "پ.د.حسن حسین صديق، ل٥٨-٦٢". "بیکۆن" بەو وتەیە بەناوبانگ بووە کە وتویەتی: "پێشکەوتنی زانستە ئەزموونییەکان ئامرازە نەک ئامانج - ئامرازە بۆ خۆشگوزەرانی خەڵک یان بە دیهێنانی ژیانێکی شایستە بۆ مرۆڤەکان، وەک ئەوەی پیشەسازی و تەکنەلۆجیای سەردەم بۆ مرۆڤایەتی بەدیهێنا. بۆیە پێویستە لەسەر زانست وامان لێبکات جیهان کۆنترۆڵ بکەین و بەردەستبخەین بۆ خزمەتی خۆمان و ژیانێکی ئاسودە و بەختەوەر. یان ئێمە زانست لە پێناو بەدیهێنانی ئەو مەبەستە پیرۆزە بەکاربهێنین. لە هەمان کاتدا و پێش ئەوەی "بیکۆن" بناغەی ئەو میتۆدە زانستیە دارِێژێت لە کەوتنە هەڵەی چەند شتێک ئاگادارمان دەکاتەوە لەژێر ناوی "وهەمەکانی ئەقڵ" کە دەبنە رێگر لەبەردەم گەشەکردنی زانست و بیرکردنەوەی زانستی،

ئەوانیش بریتیین لە "وەهمەکانی ئەشکەوت" و "وەهمەکانی هۆز" و "وەهمەکانی بازاڕ" و "وەهمەکانی شانۆ".

لێرەوە دەبینین گەورە زانایانی بواری پزیشکی و فەیلەسووفەکانیان کە هەستیانکردووە پزیشکی پێویستی بە فەلسەفە هەیە، بۆئەوەی هەمان ڕێچکەی فەلسەفە لە دیاریکردن و ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی وشە و تێگە و زاراوەکان بگرنەبەر، تا لە ئاڵۆزی و ناڕوونی وشەکان ڕزگاریان بێت، ئەمەش بووە پاساوێک بۆئەوەی باس لە گرنگی فەلسەفە بکرێت بۆ پزیشکی، بەتایبەت لە دیاریکردنی واتای وشەکانی وەک "نەخۆشی و تەندروستی". ئێمە لە ناو کۆمەڵەی پزیشکان هیچ کۆک بوونێک سەبارەت بە پێناسەی "تەندروستی" نابینین، واتا ئەوان لەسەر یەک پێناسەی کۆنکرێتی بۆ تەندروستی ڕێکنەکەوتوون، بەڵکو چەندین واتا بۆ تەندروستی دەخرێتەڕوو یان دەتوانین چەندین واتای بۆ بخەینەڕوو، بەم جۆرە مەحاڵە بگەینە دانانی پێناسەیەکی دیاریکراو و گونجاو بۆ تەندروستی. بەڵام زاناکان لەگەڕان و بیرکردنەوە بەردەوامن بۆئەوەی پێناسەیەکی تۆکمە بۆ تەندروستی بکەن کە لای هەمووان پەسەند بێت. ئێستا ئەگەر بە شوێن میتۆدێکی لۆجیکی بکەوین بۆ ئەوەی پێناسەکە

بکەین ئەویش "پێناسەیەکی نەرێنیە" " لۆجیکی پێناسەکردنی نەرێنی "واتا لە ڕێگای پێناسەی دژەکەیەوە" کە ئەویش "نەخۆشیە" هەوڵبدەین پێناسەی "تەندروستی" بکەین. بۆ پێناسەکردنی "نەخۆشی" پشت بە ناسینەوەی نەخۆشیەکە دەبەستین بە بەراوردکردنی نێوان دۆخی نەخۆشەکە لەگەڵ دۆخی ساغەکان، دۆزینەوەی کەمووکورتیەکی بیۆلۆجی یان لەکارکەوتنی ئەندامێک لە ئەندامەکان لە جێبەجێکردنی ئەرکەکەی، ئەمە دەبێتە هۆی ئازار و بێ توانایی، واتا نەخۆشی بریتییە لەو نیشانانەی پزیشکەکە تێبینی دەکات.

ئێستا هەوڵدەدەین پێناسەی "تەندروستی" بکەین، کە هەموومان لەسەر ئەوە کۆکین "تەندروتسی" خواستێکی مرۆڤانەیە، واتا هەموو کەسێک خوازیارە تەندروست بێت یان خاوەن جەستەیەکی ساغ و سەلامەت بێت، بەڵام بە تەنها خواست لەسەر تەندروستی "واتای تەندروستیمان" بۆ ڕوونناکاتەوە. ئێستا دەتوانین چوار پێناسە بۆ "تەندروستی" گفتوگۆ لەسەر بکەین ئەوانیش:

١ - تەندروستی دۆخێکی نمونەییە" " ideal state

٢- تەندروستی چوستی "لیاقە"یەکی پێویستە بۆئەوەی تاک بە باشی ئەرکەکانی وەک ئەندامێکی کۆمەڵگا ئەنجامبدات.

٣- تەندروستی کاڵایەکە بەدەستدێت و لە دەستیش دەچێت.

٤- تەندروستی هێزێکی خودییە.

سەبارەت بە پێناسەی یەکەم، تەندروستی دۆخێکی نمونەییە، مەبەستی ئەوەیە کە تەندروستی دۆخێکی ئەرێنیە لە ڕووی فیزیکی و زەینیەوە. ئەمە پێناسەیەکی پەسەندکراوە بۆ تەندروستی، بەڵام گەیشتن بەو جۆرە دۆخە کارێکی ئاسان نییە و وەک یۆتۆپیا وایە، چونکە لە ڕاستیدا هیچ کەسێک نییە لە هەموو لایەکەوە تەندروست بێت. بۆیە مەرج نیە کاتێک کەسێک هەست بە هیچ جۆرە نەخۆشیەک ناکات ئەوا تەندروست باشە، چونکە تەندروستی وەک بەختەوەری وایە تەنها خاوەنەکەی هەستیپێدەکات ئەگەرچی لە هەمان کاتدا هەندێ ئازاریش هەبێت.

هەروەها بۆ پێناسەی دووەم " تەندروستی چوستی "لیاقە"یەکی پێویستە بۆئەوەی تاک بەباشی ئەرکەکانی وەک ئەندامێکی کۆمەڵگا ئەنجامبدات. ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ تەندروستی پەسندە کاتێک دوورە لە

هەموو جۆرە بێ توانایی و ئازار و نەخۆشیەک، بەڵام لە کۆتاییدا ئەمە پێناسەیەکە گرنگیەکەی تەنها تایبەت نیە بە پزیشکان، بەڵکو لایەنی تریش لەخۆدەگرێ وەک لایەنی سۆسیۆلۆجی و سایکولۆجی، لە دواجاردا ئەم پێناسەیە پەیووەستە بە گرفتەکانی نەخۆشیە ئەقڵیەکان و دەروونیەکان و کۆمەڵایەتیەکان.

بەڵام سەبارەت بە پێناسەی سێیەم کە تایبەتە بەوەی تەندروستی کاڵایەکە بەدەستدێت و لە دەستیش دەچێت، واتا تەندروستی جۆرێکە لە تێکۆشان و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنان کە لە ڕێگای چاودێری پزیشکی و چارەسەر وەرگرتنەوە بەدەستدێت. دەبینین ئەم جۆرە تەندروستیە تایبەتە بە لایەنی پزیشکی و تەنها گرنگی بە لایەنی فیزیکی دەدات لە تەندروستیدا و لایەنەکانی تری ژیان لەبەرچاوناگرێ، چونکە مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی فیزیکی و بیۆلۆجی نیە، بەڵکو بوونەوەرێکە لایەنی شعور و هەست و هەڵچوون و باوەڕیشی هەیە، واتا دەکەوێتە ژێر فشاری چەند لایەنەی ژیان و کاریگەر دەبێت بەسەرجەم ڕووداوەکان و لە دواجاردا کاردەکاتە سەر لایەنی تەندروستی کەسەکە.

دوا پێناسەی تەندروستی جەخەت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تەندروستی بریتییە لە "هێزێکی خودی"، مەبەستی ئەوەیە تەندروستی لەوە زیاترە کە تەنها بریتیبێت لە نەبوونی نەخۆشی، چونکە کەسی ساغ و تەندروست ئەو کەسە سەرکەوتووەیە لەناو کۆمەڵگاکەیدا، بنەما ئەخلاقیەکانی وەک "خوڕاگری - ئارامی - خوراکی تەندروست - کاری گونجاو - ماڵی شیاو" ئاڕاستەی تواناکانی دەکات لەناو کۆمەڵگادا. واتا ئەو کەسانەی لە ژیاندا هەست بە نەبوونی ئەو بنەمایانە دەکەن، ئەوانەن کە لایەنی تەندروستیان باش نیە، ئەگەر کەسێک شوێنی کارکردنی نەشیاو بێت و باری دەروونی نائارام بێت و شوێنی مانەوەی نەگونجاو بێت، بێگومان باری تەندروستیشی ناجێگیر دەبێت. بۆیە زۆرجار دەبینین کە "زانستی پزیشکی" دەبێتە ڕێگر لەبەردەم تەندروستی، بە نمونە "زیادەڕەوی لە چاودێریکردنی پزیشکی ڕەنگە ببێتە هۆی دروستبوونی ئازار و ناساغی وەک ئەوەی لە ساڵی ٢٠٢٠ بە هۆی "ڤایرۆسی کۆروناوە" زیادەڕەویەکان بوونە هۆی ناجێگیری باری دەروونی و نا ئارامی خەڵکەکە و بڵاوبوونەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لەناویاندا، ئەمە وایکرد بەشێک لە خەڵکەکە بکەونە دۆخی ڕاڕایی و ترسەوە، ئەمە بۆ خۆی دەبێتە

سەرچاوەی دەرکەوتنی نەخۆشی لەناو خەڵکەکە. لە نمونەکانی تر، ئەنجامدانی نەشتەرگەری ناپێویست، یان بەکارهێنانی دەرمانی نەگونجاو، کاریگەری دەرمانەکان بە گشتی لەسەر تەندروستی کەسەکە. بۆیە تەندروستی وەک هێزێکی خودی لەپاڵ سەردانکردنی پزیشک بریتییە لەوەی کەسەکە "نەخۆش یان ساغ" وەک بوونەوەرێکی سەربەخۆ لە پزیشک توانای هەیە ژیانی خۆی ڕێککاتەوە و لەگەڵ ژینگەی دەرەوە خۆی بگونجێنێت.

لە کۆتاییدا و لە هەوڵی فەیلەسووفانی پزیشکی بۆ دیاریکردنی واتاکانی هەریەک لە "نەخۆشی و تەندروستی" دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

١- یەک واتا نیە بۆ وشەی تەندروستی، بەڵکو تەندروستی فرە واتایە، هەندێکیان لەگەڵ یەکتر ناکۆک و دژبەیەکن، لەگەڵ ئەمەدا فەیلەسووفانی پزیشکی کار بۆ ئەوە دەکەن بگەنە واتایەکی گشتگیر کە بۆ سەرجەم واتاکانی تر گونجاو بێت.

٢- ئەو واتا گشتییەی تەندروستی ئەوەیە کە دۆخە پێویستەکانی توانا شاراوەکانی تاک بەردەستدەخات بۆئەوەی سەرجەم ئەندامەکانی بە باشی ئەرکەکانی خۆی لەناو کۆمەڵگادا جێبە جێ بکات.

٣- تێگەی "تەندروستی" تەنها تایبەت نیە بە لایەنی پزیشکی، هەروەها تەندروستی تەنها بریتینیە لە تەندروستی لایەنی فیزیکی و بیۆلۆجی جەستە، بەڵکو ڕەهەند و لایەنی تر بۆ تەندروستی هەیە وەک "کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی و کلتوری"، بەوەی کە مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی فیزیکی و بیۆلۆجی نیە، بەڵکو لە هەمان کاتدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجیشە. لایەنی کلتوری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی کاریگەریان لەسەر تەندروستی تاکەکان هەیە وەک پێشتر ئامارەکان بۆکرد.

٢- چۆن زانستی پزیشکی گەشە دەکات؟

ئەمە بابەتێکی ترە زۆر لە زانا و فەیلەسووفانی پزیشکی سەرقاڵکردووە ئەویش "چۆنییەتی گەشە و پێشکەوتنی زانستی پزیشکییە"، چونکە زاناکان بە پەرۆشن بۆ پێشخستنی زانستی پزیشکی و داهێنانی میتۆد و

شێوازی پێشکەوتوو لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بە هاوکاریکردنی لایەنی تەکنەلۆجیا لە پرۆسەی نەشتەرگەریدا، یان دۆزینەوەی دەرمانی نوێ، بەڵام ئەمە تەنها بە تاقیکردنەوە دەکرێ لەسەر ئاژەڵان و مرۆڤەکان؟ هەرچەندە تاقیکردنەوەکان لەسەر ئاژەڵان دەکرێ، بەڵام بۆ مرۆڤەکان گرفتی ئەخلاقیان دێتە پێش وەک ئازاردانی مرۆڤ و لە دەستدانی ژیانی. بۆیە کردنی مرۆڤ بە بابەتی تاقیکردنەوەی زانستی واتای لێسەندنەوەی ژیان و بەکەم سەیرکردنی ژیانی مرۆڤ، ئایا بۆ پێشکەوتنی پزیشکی پێویستە ئێمە قوربانی بە مرۆڤ بدەین؟ لێرەدا زاناکانی پزیشکی خۆیان لەبەردەم سەرسامی دەبیننەوە بەوەی چۆن کار بۆ پێشەکەوتنی زانستی پزیشکی بکەن و لە هەمان کاتدا ئەو پێشکەوتنە پێویستی بەوە هەیە مرۆڤ بکرێتە کەرەستەی تاقیکردنەوەکە بۆ پێشکەوتنەکەی، چونکە خودی ئەم پرۆسەیە ڕەنگە "ژیانی مرۆڤ" بخاتەوە مەترسیەوە. بەنمونە: ئایا ئێمە قوربانی بە پێشەکەوتنی زانستی پزیشکی بدەین لەبەرامبەر مانەوە و پارێزگاریکردنی لە پیرۆزی ژیان یان قوربانی بە ژیانی هەندێ لە کەسەکان بدەین بۆئەوەی زانستی پزیشکی گەشە بکات؟ بە واتایەکی تر، چۆن ئێمە لەگەڵ ڕێزگرتن لە ژیانی کەسەکان گەشە بە زانستی پزیشکی بدەین؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسانە و سەرسامی زاناکان بە گرفتە ئاکارییەکانی ئەم بوارە، هەندێ لە گەورە زانایان و فەلسەفەکارانی بواری پزیشکی لە هەوڵی ئەوەدا بوون چەندین پێوەر دیاریبکەن تا پێشکەوتن و تاقیکردنەوەی پزیشکی پێ هەڵسەنگێنەرێت، بە تایبەت لەو تاقیکردنەوانەی لەسەر مرۆڤ ئەنجامدەدرێت. زاناکان لێرەدا سێ جۆر پێوەریان باسکردووە کە لەو سێ قۆناغەدا ڕێکخراون ئەوانیش:

قۆناغەی یەکەم/ ئەو قۆناغەیە کە داوا لەکەسی بەشداربووو دەکرێت لە پرۆسەی تاقیکردنەوەکە بەشداری بکات.

قۆناغی دووەم/ ئەو قۆناغەیە تیایدا پەیووەندی نێوان بابەتی توێژینەوە و خودی توێژەرەکە دروستدەبێ لەکاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکە.

قۆناغی سێیەم/ ئەو قۆناغەیە تیایدا دوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکە پەیووەندی نێوانیان دروستدەبێ. ئێستا ئاماژە بەو پێوەرە دەکەین:

**یەکەم: پێوەرەکانی قۆناغی یەکەم:** لەو قۆناغەدا چەندین پێوەر دیاریکراوە لەوانە:

١- پێویستە توێژەر هەموو جۆرە تاقیکردنەوەیەک ڕەتکاتەوە کە پێچەوانە و دژە ئەخلاقە وەک پێشبینیکردن بەوەی بابەتی توێژینەوەکە ڕەنگە "بمرێ یان ئەندامێکی لەدەستبدات یان ببێتە هۆی تێکچوونی باری ئەقڵی.

٢- پێویستە لەسەر توێژەر لەژێر فشاری پارە و ناوبانگی زۆر، بابەتی توێژینەوەکە نەکات بە تاقیکردنەوەی زانستی و ڕازیبکات.

٣- پێویستە توێژەر زانستیانە و زۆر بە وردی بابەتی توێژینەوەکە داڕێژێت "داڕشتی زانستیانە بۆ بابەتەکە بکات".

٤- پێویستە توێژەر ئەو بابەتانە لە بواری تاقیکردنەوەی زانستی دوورخاتەوە کە شیاوی ئەوە نیە پێشبینی ئەنجامەکانی بکات، واتا سەرەتا پێویستە بزانێت ڕێژەی سەرکەوتنی تاقیکردنەوەکە چەندە.

٥- نابێ یەک توێژەر کار بۆ داڕشتنی تاقیکردنەوەکە بکات، بەڵکو پێویستە چەندین توێژەری تر لەگەڵ خۆی بەشداربکات و هەموویان لەسەری کۆک بن.

**دووەم: پێوەرەکانی قۆناغی دووەم:** لەم قۆناغەدا چەندین پێوەر هەن لەوانە:

١- ڕێگری لەوە نییە کەسێک بە خواست و ویستی خۆی و دوور لە هەموو جۆرە فشارکردنێک(هەڕەشە - پێدانی پارە وەک پاداشت) ڕازیبێت، بەڵکو بکرێتە بابەتی تاقیکردنەوەکە بەو مەرجەی لە بەرژەوەندی کەسانی تر بێت. و پێویستە لەم دۆخەدا ئامانج و مەترسیەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە بە کەسە خۆبەخشەکان بووترێت. ئەوکات کەسەکە مافی ئەوەی هەیە ڕازیبێت یان تاقیکردنەوەکە ڕەتکاتەوە.

٢- پێویستە لەسەر توێژەر ژیان و ماف و کەرامەتی ئەو کەسە بپارێزێت کە ڕازیبووە بەشداربێ لە تاقیکردنەوەکە، وەک ئەوەی بڵێین پزیشکەکە خۆی ئەو کەسە بێت ئایا ڕازیدەبێ تاقیکردنەوەکەی لەسەر بکرێت یان نا؟ ئەگەر وەڵامەکەی نەرێنی بوو، ئەوە پێویستە هۆکارە

ڕاستەقینەکانی پشت ناڕازیبوون بۆ کەسەکە ڕوونکاتەوە و ڕێگە نەدات هیچ کەس بەشداری پێبکرێت "ئەمە بابەتێکی ئەخلاقیە" پێویستە هەموو پزیشکێک پێوەی پابەند بێت".

٣- پێویستە ئەم پرۆسەیە بە ئاشکرایی و ڕوونی و ڕاستگۆییانە ئەنجامبدرێت نەک لە ژوورە تاریکەکان "بەندیخانەکان یان شێتخانەکان"، چونکە بناغەی ئەم پێوەرە بە ئاگایی و ڕەزامەندی ڕای گشتی دەکرێ.

**پێوەرەکانی قۆناغی سێیەم:** کە پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان توێژەر و بابەتی تاقیکردنەوەکە، دوای تەواوبوونی پرۆسەکە ئەویش چەندین پێوەر لەخۆدەگرێ لەوانە:

١- پێویستە توێژەر دوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکە بەردەوام چاودێری کەسەکە بکات نەک پێویستی بە چارەسەر بێت، واتا "دوای تاقیکردنەوەکە ناکرێ فەرامۆش بکرێ"، لێرەدا دەوڵەت بەرپرسیارە لە چارەسەرکردن و پێدانی پاداشت بە کەسەکە.

٢- ئەگەر تاقیکردنەوەکە بۆ بەرژەوەندی کەسانی تر بوو، ئەوە پێویستە ئەو کەسەی خۆی بەخت کردووە بۆ تاقیکردنەوەکە لە لایەن پزیشکانەوە

سوپاس بکرێ و دەستخۆشی لێبکرێ لە ناوەندە زانستییەکان و سایتەکانی توێژینەوەی زانستی، بۆئەوەی کەسەکە هەست بەوە بکات کە ڕۆڵی هەبووە لە گەشەکردنی زانستدا.

٣- تیۆرەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشی لە لایەن پزیشکەوە.
پێدەچێت دەستنیشانکردنی نەخۆشی نەخۆشەکان لەلایەن پزیشکانەوە بە یەکێک لەم سێ تیۆرە ئاڕاستە کرابێت:

**تیۆری یەکەم:** بریتییە لەوەی پزیشک بە پێی کار و کارامەیی و لیهاتوویی خۆی چارەسەری نەخۆشەکە بکات نەک بەوەی نەخۆشەکە هەست بە چی دەکات "هەستکردنی نەخۆش بە ئازار لەکاتی چارەسەرکردن"، چونکە پزیشک ئەوەی گرنگی پێنادات لایەنی خودی نەخۆشەکەیە بەڵکو تەنها گرنگی بەو دەرمانە دەدات کە بۆ نەخۆشییەکە وەسفیدەکات و پێیوایە چارەسەری دەکات یان گرنگی بەو نەشتەرگەرییە دەدات کە پێیوایە پێویستە بۆ نەخۆشەکە بکرێت. بەڵام ناکرێ نەخۆش چارەسەر بکرێ و گوێ بە ئازارەکانی نەدرێت، بە نمونە "ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکان بە گشتی" پێویستی بە بەنجکردنی نەخۆشەکەیە "بێهۆشکردنی" بۆئەوەی

هەست بە ئازار نەکات وەک "لابردنی پرۆستات، بەردی گورچیلە، قەستەرەی دڵ".

**تیۆری دووەم:** ئەم تیۆرە پێچەوانەی ئەوەی یەکەمە، ناکرێ پزیشک بە تەنها کار بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی نەخۆشەکە بکات، بەڵکو پێویستە بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی و چارەسەری نەخۆشییەکە بڕوانێتە لایەنی ئەقڵی و عەسەبی نەخۆشەکە، بە تایبەت "نەخۆشییە دەروونییەکان"، ئەمانە دەکەونە چوارچێوەی پسپۆری نەخۆشیە دەروونیەکان، بەڵام دەکرێ بۆ ئەو نەخۆشیانە هۆکاری ئەندامی و فیزیایی هەبێت واتا کەموکورتی لە ئەرکەکانی مێشک یان ئامێری عەسەبی، کاتێک هیچ جۆرە هۆکارێکی فیزیکی بۆ ئەو نەخۆشیانە نیە ئەوە چارەسەرەکەی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشکی دەروونی و ئەقڵیەوە. بە واتایەکی تر، ئەم تیۆرە پێیوایە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش پێویستە زانین و زانیاری لەسەر کۆی ژیانی نەخۆشەکە هەبێت "ژیانی تایبەتی و ژینگەیی"، لێرەدا هەریەک لە پزیشکی و چارەسەری دەروونی و کۆمەڵایەتی بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ نەخۆشەکە هاوکار و تەبا دەبن.

**تیۆری سێیەم:** لەم تیۆرەدا پزیشک چاوپۆشی لە ئازارەکانی نەخۆشەکە ناکات وەک ئەوەی لە تیۆری یەکەم باسکرا، بەڵکو گرنگی پێدەدات و هەوڵی کەمکردنەوەی دەدات، بەڵام زۆر گرنگی بە ژینگەی دەرەوەی نەخۆشەکە نادات، بەڵکو زیاتر گرنگی بە سروشتی جەستەی نەخۆشەکە دەدات کە وەک یەکەی گشتی کار دەکات، بۆیە ئەرکی پزیشکی لێرەدا تەنها چارەسەرکردنی ئەو ئەندامە نەخۆشە نییە کە توش بووە، بەڵکو بە گشتی دەڕوانێتە هەموو جەستە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی، هەروەها دۆخە دەروونیەکانی وەک ترس و ڕاڕایی و نیگەرانی کاریگەریان دەبێت لەسەر کاری جەستە و بە پیچەوانەوە دۆخە جەستەیەکانیش کاردەکەنە سەر لایەنی دەروونی کەسەکە. لەوانەی پشتگیری لەم تیۆرە کردووە "لیدرمان"ە، کە یەکێکە لە گەورە فەلسەفەکارانی زانستی پزیشکی.

**تیۆرەکەی "لیدرمان"**

"لیدرمان" ناو لە تیۆرەکەی دەنێت "تیۆری تەواوکاری - گشتگەرا holism"" بەراوردی دەکات بە تیۆری "میکانیکی". سەرەتا گرنگە ئێمە شتێک لەسەر بۆچوونەکانی "تیۆری میکانیکی" باسبکەین، پزیشک لە

چوارچێوەی ئەم تیۆرە دەڕوانێتە نەخۆش وەک "جەستە"، جەستەیش لە چەند بەش و ئەندامێک پێکهاتووە، هەر بەش و ئەندامێک بە جیا و سەربەخۆ کارەکانی ئەنجامدەدات. ئەوەی لەسەر پزیشکە بیکات دۆزینەوەی چارەسەرە بۆ ئەو بەشەی لەکارکەوتوە و بێگوێدانە بەشەکانی تری جەستە، واتا پزیشک بەلایەوە گرنگ نییە پشکنین بۆ سەرجەم ئەندامەکانی تری نەخۆشەکە بکات. با گریمانەی ئەوە بکەین ئێمە لەبەرامبەر کەسێکداین هەست بە "بەرزبوونەوەی فشاری خوین دەکات"، ئەوە پزیشکەکە دەزانێت ئەم هۆکاری بۆ تێکچوونی دیواری شەراین و هەڵقوڵانی ڕێژەیەکی زۆری خوێن دەگەڕێتەوە. ئەوە چارەسەرەکە بەو دەرمانانە دەکرێت کە بۆ ئەو دیاردەیە دانراوە. بەڵام تیۆرەکە کۆی بارودۆخی نەخۆشەکەی پشتگوێ خست، دەکرێ بۆ هەندێ دەرمان کاریگەری نەرێنی هەبێت لەسەر بەشێک لە نەخۆشەکان، دەکرێ بەرزبوونەوەی فشارەکە بەهۆی ترسەوە بێت لە بینینی نەخۆشی ترەوە، لەگەڵ نەمانی ئەو دۆخە دەروونییە دیاردەی بەرزبوونەوەکەش نامینێت. ئەمە بۆ خۆی جەخت لە گرنگی تیۆری تەواوکاری دەکاتەوە لە

چارەسەرکردنی نەخۆشەکان، بەوەی جەستەی مرۆڤ وەک یەکەیەکی گشتی تەماشا بکرێ و سەرجەم دۆخە دەروونیەکان کاریگەریان هەیە لەسەر دۆخە جەستەیەکان.

پەیوەست بە تیۆری "تەواوکاری - گشتگەرا"، بە پێچەوانەوە جەستەی مرۆڤ "ئامراز - اله" نییە، هەرچەندە لایەنگرانی ئەم تیۆرە باوەڕیان بە کارکردنی میکانیکی جەستە هەیە، بەڵام جەستە لای ئەمان ئامراز نیە، بەشەکانی سەربەخۆیانە ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، ڕاستە بەشەکانی هەر ئامرازێک بە جیا و سەربەخۆییانە کاردەکەن و هەر بەشێکی لە کارکردن بکەوێت ئەوە ڕاستەوخۆ بەشەکە دەگۆڕن، بەڵام ئەمە بۆ جەستەی بوونەوەری زیندوو گونجاو نییە، چونکە جەستەی بوونەوەری زیندوو وەک یەکەیەکی گشتگەرا و تەواوکار کارەکانی ئەنجامدەدات، چونکە لە نێوان بەشەکانی جەستە پەیوەندی ناخەکی هەیە، واتا دروستی لە ئەنجامدانی هەر ئەندامێکی جەستە ڕاستەوخۆ کاریگەری دەبێت لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانی تری ئەندامانی جەستەکە بە شێوەیەکی تەندروست، وەک چۆن کەموکورتی لەهەر ئەندامێک هەبێ لە

ئەنجامدانی ئەركەكەی ئەوە كاریگەری دەكاتە سەر ئەندامەكانی تر لە ئەنجامدانی ئەركەكانیان "كاركردنی ئەندامانی جەستە وەک یەكەیەكی گشتی كاركردنێكی مەبەستدارە".

## تەوەری دووەم: ئاكارناسی و ئاكاری پزیشكی

بابەتی سەرەكی ئەم بەشە بریتییە لە دیاریكردنی هەندێ لەو گرفتانەی بە هۆی بەكارهێنانی تەكنەلۆجیاوە لە بواری پزیشكی بە تایبەت "هەندەسەی ویراسی-بۆماوەیی" وەک گرفتی ئەخلاقی دیاریكراوە. ئێمە لێرەدا قسە لەسەر هەردوو لایەنەكە دەكەین مەبەستم لایەنی "ئەرێنی" و "نەرێنی" بەكارهێنانی تەكنەلۆجیایە لە بواری پزیشكیدا. بۆیە لەم بەشەدا سەرەتا پێشەكییەک دەربارەی ئاكارناسی و تیۆرە فەلسەفییەكانی دەخەینەڕوو، دواجاریش قسە لەسەر هەوڵی گەورە زانایانی پزیشكی و فەیلەسووفانی دەكەین.

پێشتر لە پێناسەی پزیشكی ئەوەمان باسكرد كە "پزیشكی هەم زانست و هەم پیشەیە لە یەک كاتدا"، زانستە چونكە بابەت و میتۆد و تیۆر و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە، لە هەمان كاتدا بریتییە لە جێبەجێكردنی یاسا و

تیۆرەکانی لەسەر نەخۆش و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان. وەک هەر زانستێکی تر بە نمونە "فیزیک" زانستە و خاوەن بابەت و میتۆد و تیۆر و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە و لە زانستەکانی تری جیادەکاتەوە. لێرەدا زاناکانی پزیشکی باس لەوە دەکەن کە پزیشکی پێویستی زۆری بە بەشی بەهاکان هەیە، وە لە بەشی بەهاکان گرنگی بە ئاکارناسی دەدەن، کاتێک باس لە ئاکار دەکەن مەبەستیان ئاکاری پیشەییە، واتا ئەو بیرۆکە و بنەمایانە چین پزیشک لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆش ئاڕاستە دەکات؟ پەیووەندی پزیشک بە نەخۆشەوە چۆنە لە کاتی وەرگرتنی چارەسەر و چاودێری تەندروستی؟ ئەو بەرپرسیارێتیە چیە کە پێویستە پزیشک پێوەی پابەند بێت؟ پەیووەندی پزیشک بە گرفتە ئەخلاقیەکانی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای سەردەم لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و ئەنجامانەی وەک لێکەوت لێی دەکەوێتەوە؟ . قسە کردن لەسەر ئەم پرسانە دەکرێ پێی بوترێت ئەخلاقی پزیشکی یان ئەخلاقی بیۆلۆجی. بۆیە بەشێک لە فەلسەفەی پزیشکی بریتییە لە ئەخلاقی پزیشکی، بەشەکەی تریش بریتییە لەو بابەتانەی پێشتر باسمان کردوون. کاتێک فەلسەفەکارانی پزیشکی "زاناکانی پزیشکی" قسە لەسەر ئەخلاقی پزیشکی دەکەن، ئەوە پەنا دەبنە

بەر تیۆرە ئەخلاقیەکانی فەیلەسووفان و ئەوەی بۆ ئەوان گونجاوبێت پەسەندی دەکەن و دەیکەنە بابەتی فەلسەفاندنەکەیان. لەلایەکی ترەوە، دەبینین فەیلەسووفانی ئەخلاقی سەردەمیانە هەندێ تیۆری ئەخلاقی دەخەنە ڕوو ڕەنگە سوودی بۆ ئەخلاقی پزیشکی هەبێت.

## بابەتی زانستی ئەخلاق "ئەخلاقناسی"

بابەتی ئەخلاقناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری بۆ ڕوونکردنەوەی بیرۆکە ئەخلاقیەکان و بنەما و بەها ئەخلاقیەکان، بیرۆکە بنەڕەتیەکانی ئەخلاق "دوو بیرۆکەن" ئەوانیش "بیرۆکەی چاکە" و"بیرۆکەی واجب - ئەخلاقی ناچاری"، بەڵام بنەما ئەخلاقیەکان بریتیین لە یاسا و ڕیاسا ڕەفتاریەکانی مرۆڤ وەک ئەوەی بڵێین "ڕاستگۆیی و دادگەری و چاکە و ئازایەتی و خۆشەویستی و قوربانیدان" "لە چاکەکان و فەزیلەتەکانن"، بەڵام هەریەک لە "درۆکردن و خیانەت و ترسنوکی و ستەمکردن و ڕەزیلی و خۆبەزلزانی" هەموو ئەمانە دەکەونە نێو خانەی "خراپەکان - ڕەزالەتیەکان". لێرەوە زانستی ئەخلاق "ئەخلاقناسی" کار لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو بنەمایانە دەکات. ئایا بنەماکانی

ئەخلاق ڕێژەیین یان ڕەهان؟ هەروەها لێکۆڵینەوە لە بابەتی بەرپرسیارێتی مرۆڤەکان دەکات بەرامبەر بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی لەژێر تیۆرەکانی "جەبر و ئیختیار". وەک دەزانین لێکۆڵینەوەکان پێویستیان بە میتۆد هەیە، ئایا میتۆدی ئەوان چیە؟ ئەخلاقناسان دوو جۆر میتۆد بۆ لیکۆڵینەوەکانیان پەیڕەودەکەن ئەوانیش: "میتۆدی وەسفی" تەنها ئەوەی هەیە لە ڕەفتار و ئاکار وەک خۆی وەسفیدەکات". میتۆدی دووەم بریتییە لە تێپەڕاندنی وەسفکردنەکە بۆ دارشتنی ئەوەی پێویستە بکرێ یان ڕەفتاریان چۆن بێت. واتا وەسفکردنەکە لە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەی سایکولۆجی بۆ هەریەک لە "چاکە و واجب" ئەوەیە لەگەڵ خواست و چێژی تاکەکان دەگونجێت، وە لە ڕوونکردنەوەی کۆمەلایەتیدا "واجب" بریتییە لەوەی کە کۆکە لەگەڵ نەریتە کۆمەلایەتیەکان، یان ڕوونکردنەوەی بیۆلۆجی بۆ "چاکە" بریتییە لەوەی ئەندامەکانی جەستە بە باشترین شێوە ئەرکەکانیان ئەنجام دەدەن. بەلام لە میتۆدی دووەم "دارشتنی شێوازێک بۆ ئەخلاق"، واتا "ڕەفتاری مرۆڤەکان چۆن بێت؟"، لێرەدا گرنگی بە شیکردنەوەی واتاکانی چاکە و واجب لە چوارچێوەی باوەڕێکی ئایینی یان تیۆرێکی

فەلسەفی لەسەر سروشتی مرۆڤ باس لەوە دەکرێ کە ڕەفتاری مرۆڤەکان دەبێ چۆن بێت نەک وەک ئەوەی هەیە.

## گرنگترین تیۆرە ئەخلاقیەکان لە فەلسەفەدا

١- تیۆری ئەقڵی لای سۆکرات (٣٩٩-٤٧٠): "سۆکرات" بە بنەمایەک دەستپێدەکا کە ڕوون و ئاشکرایە و دەڵێت: "هەموو کەسێک حەزی چاکەی هەیە و ڕقی لە خراپەیە" واتا سروشتی مرۆڤەکان چاکەخوازییە و حەزیان بە کردنی چاکەیە و لە خراپەکردنی ڕادەکەن و هەڵدێن و ڕقیان لە خراپەیە. بۆیە ڕەفتاری چاکە پێویستی بە بنەمای ئەخلاقی بابەتی هەیە، ئەم بنەمایانە بە دیاریکردن و پێناسەکردنێکی دروست بۆ تێگە و وشە ئەخلاقیەکان دەبێت. واتا پێویستە هەمووان لەسەر یەک واتا بۆ هەریەک لە "دادگەری و چاکە و ڕاستگۆیی و دەستپاکی و تەقوا" ڕێکبکەوین، بەڵام پێویستە ئێمە ڕەچاوی ئەوە بکەین کە بنەما ئەخلاقیەکان ڕێژەیین و بەپێی بارودۆخەکانی ژیان دەگۆڕێن "وەرگێڕ"، چونکە ناکرێ من "خیانەت نەکەم کاتێک مامەڵە لەگەڵ ناحەز و دوژمنان دەکەم" یان درۆ نەکەم کاتێک گیانی کەسێک لە مردنی بە ناحەق ڕزگاردەکەم. هەروەها

"سۆکرات " باس لەوە دەکات مرۆڤ تەنها جەستە نییە، بەڵکو لە پاڵ جەستەدا روح و ئەقڵ و دەروونیشی هەیە، بۆیە ڕازیکردنی سەرجەم داواکانی نەفس و دەروون دەبێتە هۆی لاوازکردنی لایەنی ئەقڵی مرۆڤەکان، بۆیە لەسەر مرۆڤەکان واجبە هەر کاتێک ویستیان لایەنی ئەقڵی و روحی خۆیان بەهێز بکەن، ئەوە پێویستە داواکاریەکانی نەفس و شەهوەتەکان کەم بکەنەوە.

٢- تیۆری چێژ لای "ئەپیکۆر ٣٤١ - ٢٧٠.پ.ز" : یەکێکە لە فەیلەسووفە یۆنانییەکان و خاوەنی تیۆرێکە لە فەلسەفەی ئەخلاق کە بە تیۆری "چێژ" ناسراوە. پوختەی تیۆرەکەی بریتییە لەوەی کە هەموو مرۆڤێک سروشتی وایە بەرەو بەختەوەری هەنگاو دەنێت و لە نەهامەتی هەڵدێت. بەختەوەری لە دیدی ئەپیکۆرەوە بریتییە لە "چێژوەرگرتن" و نەهامەتیش بریتییە لە "ئازار". ئەو پرسیارەی لێرەدا زەق دەبێتەوە ئەوەیە "ئایا مەبەستی ئەپیکۆر لە چێژ چییە؟ تا چەند لەگەڵ چێژی هەستی و کاتییە؟ چێژوەرگرتن لە پارە و پلە و پێگە و سامان، مرۆڤ بەختەوەر دەکەن؟.

لێرەدا دەبینین "ئەپیكۆر" باس لەوە دەكات كە "چێژوەرگرتن" تەنها لە "چێژە هەستیەكان و جەستەییەكانی وەک خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و ماڵ و سیكس" ، هەروەها لە چێژە كاتیەكانی وەک "چێژی ڕواڵەت و پلە و پێگە و دەسەڵات و سەروەت و سامان ناوبانگی" كورت نابێتەوە، بەڵكو "چێژی ئەقڵیش" دەكەوێتە چوارچێوەی تێگەی "چێژەوە". واتا ئێمە لە ژیاندا ئەگەر هاتوو توشی چێژێكی دوور مەودا بووین ئەوە بۆ خۆی چاكەیە، بە پێچەوانەوە ئەگەر توشی چێژێكی كورت ماوە بووینەوە ئەوە بۆ خۆی "خراپە". بەڵام مەرج نیە هەموو چێژێک چاكە بە دوای خۆیدا بهێنێت، هەروەها هەموو ئازارێكیش خراپە بە دوای خۆیدا بهێنێت، چونكە هەندێ چێژوەرگرتن هەیە ئازار بە دوای خۆیدا دەهێنێت وەک چۆن هەندێ ئازار هەیە چێژ بە دوای خۆیدا دەهێنێت، بۆیە پێویستە ئێمە ئەو چێژانە تێربكەین كە دوورمەودان ئەگەر چی هەندێ ئازاریشمان بە هۆیەوە بەربكەوێت، هەروەها پێویستە ئارام بین بەرامبەر بەو ئازارانەی كە دەبنە هۆی چێژێكی دوورمەودا. بەڵام سەبارەت بە چێژی ئەقڵی یان چێژە ئەقڵیەكان، ئەپیكۆر دەڵێت: بریتییە لە "حەزكردن بە زانین" بە تایبەت زانین بە خود "ناسینەوەی خۆت"، كەواتە خود ناسین گەورەترین چێژە

مرۆڤ بتوانێت بەدەستی بهێنیت "وەرگێڕ". هەر کاتێک بە باشی "خۆت ناسییەوە" ئەوکات دەزانیت ئەو شتانە چین ئازارت پێ دەبەخشن و ئەو شتانەش کە چێژت پێ دەبەخشن، هەمو ئەمانە لە ئەنجامی "خود ناسیەوە" دەبێت "وەرگێڕ". لای "ئەپیکۆر" چێژی ئەقڵی بە هەمان شێوە لە "خود ناسیەوە" دەستپێدەکات، ناسینی خود دەبێتە هۆی ئارامی دەروون، هەروەها حەزکردن بە زانین بە تایبەت زانینی یاساکانی ژیان و جیهان و شتەکانی ناو جیهان، هەموو ئەمانە دەبنە هۆکاری بەختەوەربوونی کەسەکە، هەروەها بوونی "دادگەری و چاکە و ئازایەتی و ڕاستگۆیی و شەرف و ئەمانەت" لەناوماندا هۆکارە بۆ بەختەوەربوونمان و چێژوەرگرتن لێیان.

٣- تیۆری واجب" ئەرک"لای کانت "١٧٢٤ - ١٨٠٠": فەیلەسووفێکی ئەڵمانی مۆدێرنە، کاریگەری زۆری لەسەر بیرمەندان و فەیلەسووفانی دوای خۆی هەبووە، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە باسی بکەین "تیۆرەکەیەتی لە ئەخلاق" واتا بۆچوونە ئەخلاقیەکانی، لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژە بە بۆچوونە ئەخلاقیەکان دەدەین. "کانت" ئەوە ڕەتدەکاتەوە چێژ و تێرکردنی پاڵنەرە غەریزەیەکان بابەتی چاکەی ئەخلاقی بن، چونکە چێژەکان و

پاڵنەرەکان "خۆخۆیی - ئانانیەت" لەخۆدەگرن، هەروەها ئەوەش ڕەتدەکەینەوە کە مەبەستی ئەخلاقی ئێمە "بەختەوەری" بێت، چونکە خودی بەختەوەریش لە کۆتاییدا دەبێتە "چێژ وەرگرتن" بە هۆی ئاڵۆزی تێگەی بەختەوەریەوە. بۆیە ئەخلاقی ناچاری فەرمان بە ملکچبوونمان دەکات بۆ یاسای ئەخلاقی. واتا ئێمە دەبێ ملکەچی یاسا ئەخلاقیەکان بین یان ملکەچی واجب بین، ئەوەی ئەرکە ملکەچی بین، ئەم ملکەچبوونە بۆ یاسای ئەخلاقی ملکەچبوونێکی ئەقڵیە نەک ئایینی، واتا سەرچاوەی ملکەچبوونەکە ئایینی نیە بەڵکو ئەقڵیە، واتا مرۆڤ خۆی یاسا ئەخلاقیەکان دادەنێت و هەر خۆیشی جێبەجیان دەکات. لێرەدا دەکرێ واتای یاسای ئەخلاقی ڕوونکەینەوە ئەگەر وتمان هەندێ لە کردەوەکان بە پاڵنەرو غەریزەکان ڕاڤە ناکرێن بە نمونە "تاودانم" بۆ ڕزگارکردنی کەسێک لە خنکان کە ڕەنگە ژیانی خۆم بکەوێتە مەترسیەوە" لێرەدا دەبینین ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم نمونەیە پەنا بۆ غەریزەکانم ببەم ئەوکات کەسەکەم ڕزگار نەدەکرد، چونکە ژیانی خۆم گرنگترە لەوەی ژیانی ئەو ڕزگار بکەم و ژیانی خۆم لە دەستبدەم. لە نمونەیەکی تردا "بەخشینی بەشێک لە سەروەت و سامانی خۆم بۆ ڕزگارکردنی لێقەوماوان هیچ

لەگەڵ غەریزەی موڵکایەتی و خۆشگوزەرانی یەک ناگرێتەوە". بۆیە دەپرسین "واتای یاسای ئەخلاقی چیە". واتاکەی بریتییە لە: "کارێک بکە ،کە ڕەنگە لە یاسایەکی گشتی بچێت بۆ هەموو خەڵک". واتا کارەکەت لە کاری خەڵکی بچێت نەک پێچەوانەی کاری خەڵک بێت ئەو کات بە کارێکی ئەخلاقی وەسف ناکرێت. ئەو کارانەی لە تاریکی و شوێنە نادیار و شاراوەکانی ئەنجام دەدرێت کاری ئەخلاقی نین، یان بەکاری ئەخلاقی وەسف ناکرێن. واتا "یاسای ئەخلاقی ئەرکە - واجبە".

کەواتە فەلسەفەی ئەخلاقی مۆدێرن چەند ڕێبازێکی لێکەوتەوە، هەندێ کەس دەیانویست بنەمایەکی عەقڵی بیرکارییانە بۆ ئەخلاق دابنێن، مرۆڤەکان بەناو خواوە مافی ئەوەیان نییە کەس بە تاوانبار لە قەڵەم بدەن، یان بەچاوی تاوانبار بڕواننە مرۆڤ، نیچە وتەنی ئەم بیروباوەڕانە ڕیشەیان لە خولقاندنی ئەخلاقی مێگەلدایە. لایەنێکی دی ئەخلاقی مۆدێرن برەودان بە سۆز و خۆشەویستی وەکو بابەتێکی مرۆییە،. کەسانێکی وەکو، هۆبز و جۆن لۆک لایان وابوو مرۆڤ پێویستی بە پەیمانی کۆمەڵایەتی هەیە، واتە یاسا و ڕێسایەکمان پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بەرەو شارستانییەت هان بدات. ئەخلاق سەربەستانە لەناو کۆی

کۆمەڵگەدا بایەخی پێدرا و لەگەڵ یاسادا یەکیان گرتەوە، واتە مرۆڤ خاوەن ژیارە بۆیە عەقڵ و ئەخلاق ڕێگەیان بۆ پتەوکردنی یاسا خۆشکرد. ئەمە یاسایە مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەدا پێکەوە گرێدەدات. پێش کانت هەندێ لە فەیلەسووفەکان بەتایبەت، هاچسێن بنەمای ئەخلاقی لەسەر هەستی ئەخلاقی مرۆڤەکان دامەزراند، هەر لەم ڕێگەیەوە لە نێوان فەزیلەتی ئەخلاقی و نەبوونی ئەخلاقی جیاوازی دانا. فۆرمی ئەخلاق ئەوە بوو مرۆڤ لەم دنیایەدا تا ڕادەیەک بە بەختەوەری و ئازادی بگات و لە سنوورەکانی ئازادی تێنەپەڕێ و سەربەستی مرۆڤەکانی دیکە زەوت نەکات "وەرگێڕ".

٤- تیۆری سوودگەرایی گشتی "جۆن ستیورات میل - ١٨٠٦ - ١٨٧٣" : کورتەی ئەم تیۆرە: "چاکە بریتییە لە بەدەستهێنانی زۆرترین چێژ و کەمترین ئازار بۆ زۆرترین تاکەکانی کۆمەڵ، واتا "کردەی ئەخلاقی بە ئەنجامە باشەکان و چاکەکانی بە نسبەت خەڵکەوە دەپێورێت. هەروەها ئەو کردەیەی کە دەبێتە هۆی ئازارێکی کەم و بەدەستهێنانی چێژێکی زۆر لە داهاتوودا بۆ خەڵکەکە، ئەوە کردەیەکی ئەخلاقیە. بەڵام "کردەی هەڵە و ناڕاست، ئەو جۆرە کردانەن ڕێژەیەک لە ئازار بۆ تاک و کۆمەڵ

دروستدەکەن کە لە هەمان کاتدا نەبووەتە هۆی چێژ بۆ کەسانی تر. بە نمونە وا گریمانەبکە کە دەتەوێت منداڵەکەت ببێتە قوتابخانەیەک و تێچووەکەی زۆرە و لە تواناتدایە بڕە پارەکە بدەیت، وە گریمان زانیاریت هەبوو کە قوتابخانەکە بەشێک لەو پارەیە بۆ منداڵە بێ باوکەکان خەرجدەکات یان بۆ منداڵە هەژارەکان، ئەگەر ئەو کارەت کرد ئەوە بزانە کارێکی مەزن و ئەخلاقیت ئەنجامداوە. بۆیە پێویستە هەمووان وەک مرۆڤ بیر لەیەکتر بکەینەوە و وەک مرۆڤ ژیان بکەین، نەک وەک ئەوەی لە جیهانی ئاژەڵاندا هەیە، لێرەدا "جۆن ستیورات میل" دەڵێت: "من جیهانێکی مرۆییم پێ باشترە لە جیهانێکی بەراز ئاسا"، هەروەها دەڵێت: "پێم باشە مرۆڤێکی ژیری هەژاربم لەوەی ئاژەڵێکی بەختەوەربم".

٥- تیۆری حەدسی، پێنجەم تیۆرە لە تیۆرە ئەخلاقیەکان، زۆربەی فەیلەسووفانی ئەم ڕێبازە بانگەشەیان بۆ کردووە، سەرەتا بە ڕەتکردنەوەی گەیشتن بە هەموو جۆرە چێژێک دەستپێدەکات، واتا ئێمە ناتوانین هەموو جۆرە چێژێک بەدەست بینین، هەروەها ڕەتکردنەوەی ئەقڵ وەک پێوەرێک بۆ دیاریکردنی کردەی ئەخلاقی تەندروست و جڵەوگیرکردنی هەڵچوونی خەڵکی. هەروەها ڕەتکردنەوەیکردەوە باشەکان لەگەڵ خەڵکی بکرێتە

پێوەرێک بۆ بەها ئەخلاقیەکان، چونکە لای ئەمان "حەدەس پێوەرە" نەک "ئەقڵ"، بۆیە دەپرسین "حەدەس چیە؟". لە پێناسەی ئەوان بریتییە لەو توانا سروشتیەی تیاماندا هەیە کە بە هۆیەوە دەتوانین دەرک بە ژمارەیەک بیرۆکەی ئەخلاقی بکەین کە پێی دەوترێت "هەستی ئەخلاقی". بە هەستەکانمان دەرک بە شتەکان و ڕووداوەکانی دەرەوەی خۆمان دەکەین، بەڵام بە "هەستە ئەخلاقیەکان" ڕاستەوخۆ دەرک بەوە دەکەین کە هەریەک لە "ڕاستگۆیی و ئەمانەت و پارێزگاریکردن لە بەڵێن و پەیمانەکان کاری چاکەن"، وەک چۆن جیایان دەکەینەوە لە "درۆکردن و دزیکردن و خیانەت" کە ئەمانە لە کارە خراپەکانن، واتا ئێمە ڕاستەوخۆ دەزانین کام کردە ئەخلاقیە چاکەیە و کامیان خراپەیە. بە نمونە ئێمە بە چاوەکانمان ڕەنگەکان دەناسینەوە بەهەمان شێوە بە حەدەس چاکە و خراپەکان دەناسینەوە. هیچ کەسێک لە ئێمە ئامادە نیە بە سروشتی خۆی ئەوە بڵێت کە "درۆکردن و دزیکردن لە ئەمانەت پارێزی باشترە"؟ کەواتە بیرۆکەکانی چاکە و واجب ڕاستەوخۆ دەرکیان پێدەکرێن و دەزانرێن و جیادەکرێنەوە لە بیرۆکە خراپەکان.

## تیۆرەکانی ئەخلاقی پزیشکی

لەم بەشەدا باس لە سیفات و تایبەتمەندی تیۆرەکانی ئەخلاقی پزیشکی دەکەین، بۆیە دەبینین "سیفاتەکانی" ئەخلاقی پزیشکی تایبەتە بە پزیشکەکان و ئەوانیش بە دووخاڵی گرنگ هەڵوەستەیان لەسەر دەکرێ:

**یەکەمیان:** ئەخلاقی پزیشکی پێویستە عیلمانی بێت.

**دووەمیان:** نابێ لە یاسا و ریاسای گشتی و ڕەها و نەگۆڕ پێکهاتبێ.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، مەبەست لەوەی پێویستە ئەخلاقی پزیشکی عیلمانی بێت ئەوەیە کە ئەخلاقی پزیشکی دەبێ دوور بێت لەهەموو جۆرە باوەڕ و عەقیدەیەکی ئایینی و مەزەهبی، ئەمە واتای ئەوە نیە کە پزیشکان "ئاڵای بێ باوەڕی خۆیان" بەرزکردوتەوە، بەڵکو مەبەستەکە زیاتر بریتییە لەوەی پزیشکەکان بیرکردنەوەیان مرۆیی بێت و گرنگی تەنها بە مرۆڤ بدەن "هەموو مرۆڤێک بۆ ئەوان وەک یەکن". بە نمونە ئەخلاقی پزیشکی بۆچوون و هەڵویستی سوفیانەی "سۆکرات" پەسەند ناکات بەوەی کە بەختەوەری مرۆڤ لە دژایەتیکردنی حەز و ئارەزووەکانیدایە، ئەمە لە ڕوانگەی بیۆلۆجیەوە لای پزیشکان دژ بە سروشتی مرۆڤە وەک ئەوەی کە

بوونەوەرێکی بیۆلۆجیە. هەروەها ئەخلاقی عیلمانی ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە ئەخلاقی پزیشکی شوێن ئاراستەیەکی فەلسەفی پێش ئەزموونی بکەوێت، واتا هەموو ئەخلاقیکی پزیشکی ئەگەر ئاراستەیەکی فەلسەفی پێش ئەزموونی لەخۆبگرێ ئەوە ڕەتدەکرێتەوە و پەسەند نیە، وەک دانانی یاسای ئەخلاقی دوور لە ژیانی هەڵکەوتەی ڕۆژانەی مرۆڤەکان.

پەیووەست بە تایبەتمەندی دووەم، بریتییە لە ڕەتکردنەوەی هەموو بنەمایەکی ئەخلاقی ڕەها و جێگیر و نەگۆڕ. بەڵکو پێویستە بەها ئەخلاقیە پزیشکیەکان دینامیکی بێت و لەگەڵ کات و شوێن و کلتور بگونجێت، واتا بە گۆڕانی فاکتەرەکانی ژیان ئەویش بگۆڕێت، چونکە هەموو نەخۆشێک حاڵەتێکی تایبەتە. بە نمونە دەوترێت: "دەرفەتی نوێ ئەرکی نوێمان فێردەکات"، لەبەرئەوە ناکرێ یاسا ئەخلاقیەکان بریتیبن لە فەرمانی ڕەق و توند و دوور لە هەڵکەوتەی ژیان، هەر یاسایەک دووربێت لە ژیان جێبەجێکردنی مەحاڵە، بەڵکو پێویستە یاساکانی ڕێژەیی بن و لەگەڵ دۆخەکان بگونجێن. لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ ئەویش "ئەخلاقی پزیشکی" هیچ گرفتی لەگەڵ بەها ئەخلاقیەکان نیە کە فەیلەسووفان بانگەشەیان بۆ کردووە وەک "ڕاستگۆیی و ئەمانەت و

ئارامی "، بەڵام لە هەمان کاتدا گرنگی بە بەهای ئەخلاقی تر دەدەن کە لەگەڵ پیشەکەیان دەگونجێت، بە نمونە ئەو بەها ئەخلاقیانە "پێشکەوتن و گەشەکردنی زانستی پزیشکی" و "ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەر نەخۆشەکان" و "چاودێری تەندروستی" و "یەکسانی نێوان سەرجەم کەسەکان لە ڕووی ئەرک و مافەوە" و "کارکردن و فێربوون لەپێناو دۆزینەوەی شتی نوێیدا" لەخۆدەگرن. ئەمانە ئەو بەهایانەیە کە پێویستە پزیشک پابەندبێت پێوەی، لە هەموویان گرنگتر ڕێزگرتنە لە خودی مرۆڤ "ڕێزگرتن لە کەسەکە بەهایەکی نەگۆڕ و ڕەهایە". هەروەها چەندین بەهای تر هەن کە پزیشک لە پیشەکەیدا کاریان پێ دەکاتە لەوانە: "مرۆڤ کاڵایەک نیە کڕین و فرۆشتنی پێوەبکرێ" و "پارێزگاریکردن لە ژیانی مرۆڤ، چونکە ژیان پیرۆزترین شتە بۆ مرۆڤەکان" و "ڕێزگرتن لە نەخۆش ئەگەر تاوانباریش بوو" و " کۆرپەلە و منداڵی تاز لە دایکبووو مافی ئەوەیان هەیە کەمئەندام نەبن". لێرەدا پێویستە ئاماژە بە هەندێ لە ئەخلاقە پزیشکیەکان بکەین کە زانا و فەیلەسووفانی پزیشکی هەوڵی دارشتنیان داوە لەوانە:

١-هەوڵی بەشێک لە گەورە زانایان و فەیلەسووفانی پزیشکی:

أ- هەموو مرۆڤێک دەیەوێت ئەوەی چاکە بیکات و لە خراپە دووربکەوێتەوە.

ب- پێویستە مرۆڤ بۆ کاری چاکە و چاکەکردن تێکۆشەربێت و هەست بە پابەندبوونی ئەخلاقی بکات لە ناخی خۆیدا.

ج- لە بەرپرسیارێتی ئەخلاقیماندا خواستی ئەوەمان نیە بگەینە حاڵەتی "کامڵبوون" بەڵکو زیاتر پێویستمان بەوە هەیە لە کارکردنماندا ڕاستگۆ و جدی بین.

ت- سەرجەمی ئەوەی پێیدەڵێن چاکەی ئەخلاقی یان واجبی ئەخلاقی، لە ڕاستیدا پێویستە ئەوەی بۆمان دەکرێ بیکەین و ئەوەی بۆمان ناکرێ نەیکەین.

بۆیە کارە چاکەکان و ڕاستەکان بە سوسە دەرکیان پێدەکرێ، سوسە بریتیبوو لە دەرککردنی ڕاستەوخۆ بۆ بیرۆکە چاکەکان و خراپەکان، ئەسڵ وایە مرۆڤ دان بەوەدابنێت کە ڕاستگۆیی و ئەمانەت لە خۆیاندا چاکەن، چونکە لە سروشتی مرۆڤدا نیە ڕەوایەتی بە دزیکردن و کوشتن و خیانەت بدات و بەکاری چاکە وەسفیان بکات. هەموو ئەوانەی باسمانکرد لە

دواجاردا سودی زۆری هەیە لە هەبوونی پەیووەندی نێوان "پزیشک" و "خەڵکەکە".

٢- هەوڵەکانی "دافید برین- مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی - ئەبردین" لە دارشتنی ئەخلاقی پزیشکیدا:

دەکرێ ئێمە بەختەوەری ژیانی مرۆیی بەوە ڕاڤەبکەین، کە مرۆڤ بوونەوەرێکی فیزیکی سایکۆلۆجیە، لایەنی فیزیکی مرۆڤ لایەنە بیۆلۆجیەکەیتی "جەستەی زیندوو"، بەڵام لایەنە سایکۆلۆجیەکەی بریتییە لە دۆخە هزری و دەروونییەکانی. با سەرەتا قسە لە سەر لایەنی یەکەم بکەین، هەموو مرۆڤێک پێویستە بەختەوەری خۆی بە دەستبهێنێت کە ئەویش بریتییە لە چێژوەرگرتن یان خۆشی. تێگەی "چێژوەرگرتن" واتایەکی فراوانی هەیە، کە خۆی دەبینێتەوە لە جێبەجێکردنی داواکارییە جەستەییەکانی وەک خواردن و خواردنەوە و شوێنی حەوانەوە و پۆشاک، هەروەها لە بیستنی مۆسیقا و سەماکردن و وەرزشکردن و داواکردنی زانین و زانست...هتد، واتا "چێژوەرگرتنەکە کامڵ و تەواوکاریە و خۆی لە

تێرکردنی پێدوایستیەکانی تاکدا دەبینێتەوە. لێرەدا هیچ زیانێک لە تێرکردنی چێژەکاندا نییە، تەنها زیان ئەگەر هەبێت لە زیادەرەویکردن لە خواردن و خواردنەوە و سێکس و بینینی نمایشی توندوتیژی و گوێگرتن لە موسیقای دەنگ بەرز، ئەمانە زیان بە جەستە و دەروونی مرۆڤ دەگەیەنێت. لەنێو توخمەکانی چێژوەرگرتن "داهێنان "، لە بواری هونەری بێت یان ئەدەبی یان کاری ڕۆژانە. ئەوەی هاوکارە لە دروستبوونی توانای "داهێنان" بوونی جەستەیەکی ئارام و کەشێکی هێمن و زەینێکی هێمنە، چونکە "داهێنان" بە مێشکێکی ماندوو ناکرێت.

پەیووەست بە لایەنی دووەم "لایەنی سایکۆلۆجی" و گرنگی لە ژیانی تاکدا، ئێمە ئەگەر بڕوانینە ژیان و سروشتی مرۆڤ، ئەوە دەبینین کە ئەم ژیانە سەرەتا لە خیزانەوە دەستپێدەکا و تێردەکرێ لەتەک بنەماکانی ژیان ئەمەش زیاتر لە ڕێگای پەروەردەکردنەوە، وەک دەزانین پەروەردە چەندین پابەندبوونی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و بەها ئەخلاقیەکان لەخۆدەگرێ، لەوانە "ملکچبوون بۆ فەرمان و قسەکانی باوک و دایک" و "دانپێدانان بەوەی کە ئێمە قەرزاری ئەوانین"، لە قۆناغی پەروەردەکردنی تاک "دایکان و باوکان" چەندین بەهای ئەخلاقی لە ناخی تاکدا دەڕوێنن وەک

"ڕاستگۆیی و دادگەری و دەستپاکی و ئەمانەت و دڵسۆزی لە کارکردن و ڕێزگرتن لە کەسانی تر". دوای ئەمە ڕۆڵی ژینگەی دەرەوە لە چەسپاندنی ئەو بەها ئەخلاقیانە و ڕاستکردنەوەی هەموو لادان و چەوتییەک لەخۆدەگرێ.

## تەسکی سێیەم: سروشتی ئەقڵی مرۆیی

لێرەدا گرنگە ئێمە ئاماژە بە بۆچوونی زانایانی پزیشکی سەبارەت بە سروشتی ئەقڵی مرۆیی بدەین و بزانین ئەوان چۆن باسیان لەم بابەتە کردووە.؟ مەبەست لە ئەقڵ بریتییە لە "ژیانی دەروونی یان ژیانی شعوری" مرۆڤەکان وەک "هەستکردنەکان و ویژدانەکان و دەرکپێکردنەکان و یادکردنەکان و بیرکردنەوەکان...هتد. پێش ئەوەی بۆچوونی فەلسەفەکارانی پزیشکی لەسەر ئەم بابەتە بخەینەڕوو، گرنگە ئێمە تیشک بخەینە سەر بۆچوونی "فەیلەسووفان" سەبارەت بە "گرفتی ئەقڵی مرۆیی"، ئەمە گرفتێکی ڕاستەقینەیە لە دیدی فەیلەسووفانەوە و هەندێ جار بەشێک لە گرفتەکە شیاوی چارەسەرکردنە و بەشەکەی تری چارەسەرکردنی مەحاڵە. تیۆر و بۆچوونی فەلسەفییەکان زۆرن، بەڵام ئێمە

وەک دەروازەیەک بۆ قسەکردن لەسەر هەڵویستی پزیشکان لەسەر گرفتەکە، تەنها کورتەی "چوار" لە تیۆرە فەلسەفیەکان باس دەکەین:

١- تیۆری فسیۆلۆجی: لایەنگرانی ئەم تیۆرە پێیانوایە ئەقڵ تەنها بریتییە لە "دەماغ - مێشک" ، یان کۆی ژیانی ئەقڵی مرۆڤ دەتوانرێت لە ڕێگای یاساکانی زانستی ئەرکێتی ئەندامەکانەوە ڕاڤەبکرێ، سەرجەمی ئەوەی هەمانە لە ئەزموون و شارەزایی "دەروونی و ئەقڵی" هەموو دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوە فسیۆلۆجیەکانی ناو ئامێری عەسەبی یان دەماغ.

٢- تیۆرەکەی "دیکارت" فەیلەسووفی فەرەنسی " ١٥٩٥ - ١٦٥٠ "، ئەم فەیلەسووفە دژ بە بۆچوونی تیۆری یەکەم باس لەوە دەکات، کە جیاوازی لە نێوان "جەستە و دەروون" هەیە. لە تایبەتمەندیەکانی جەستە "کشان" واتا جەستە شتێکی کشاوە لە شوێندا و شێوەیەکی تایبەتی هەیە و شیاوی دابەشکردنە بۆ ئەو بەشانەی لێی پێکهاتووە. بەڵام "ئەقڵ" جیاوازە، تایبەتمەندییکەی "هزرینە" و شیاوی دابەشکردن نیە و لە هیچ شوینێک نەکشاوە، بەڵکو ئەوە بریتییە لە "هزر". واتا جەستە کشاوە و بیرناکاتەوە، بەڵام ئەقڵ نەکشاوە و بیردەکاتەوە، هیچ لێکچوونێک نیە لە نێوان برسێتی

و ویستی نان خواردن، ئەو شتەی دەبێتە هۆی ئازار و هەستکردن بە ئازارەکە، لەگەڵ ئەمەدا دەبینین "دیکارت" باس لە هەبوونی پەیوەندی "هۆ- ئەنجام" دەکات لە نێوان ڕووداوەکانی جەستە و دۆخە دەروونیەکان، وەک ئەوەی بڵێین هەڵچوونی ترس و توڕەیی دەبێتە هۆی عارەقکردنی زیاتر و لەرزینی ماسولکەکان.

٣- تیۆری "سیبیرنتیقا". ئەم زانستە بانگەشە بۆ ئەمانە دەکات:

أ- ئامیری عەسەبی بە گشتی و مێشکی مرۆیی بە تایبەتی تەنها بریتییە لە نمونەیەک لە "کۆمپیوتەری ئەلکترۆنی"، بە هۆی لێکچوونی نێوان سەرجەم ئەرکەکانی مێشک و ئەرکەکانی کۆمپیوتەر، هەردووکیان بە شێوەیەکی میکانیکی ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن. وەک چۆن "جۆن سیرل" دەڵێت: "دەماغ بریتییە لە کۆمپیوتەر". "وەرگێڕ".

ب-دیزاینی کۆمپیوتەر و ئەرکەکانی ئاماژەن بۆ سەرکەوتوویی کۆمپیوتەر لە خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگە و ڕەفتاری مەبەستدار، ئەم جۆرە خۆگونجاندنە لە تایبەتمەندی بوونەوەری زیندوودا هەیە، بۆیە

دەکرێ بڵێین کۆمپیوتەر هاوشێوەی ئەقڵی مرۆڤ ڕەفتاردەکات بەوەی شتەکانی بیردێتەوە و گرفتەکانی چارەسەردەکات و کاری بەڵگەهێنانەوەکانیش ئەنجامدەدات، وەک ئەوەی بڵێین "مرۆڤێکی دەستکردە - رۆبووتە". واتا دەتوانین ڕووداوەکانی ناو ئەقڵی مرۆیی بە یاساکانی زانستە ئەزموونیەکان ڕاڤە بکەین.

ت-تیۆری پەرەسەندنی هەڵقوڵاو: زانایانی ئەم تیۆرە کۆکن لەسەر ئەوەی هەرچی لەم گەردوونەدایە ملکەچی یاساکانی زانستە سروشتیەکان دەبێت "فیزیک و کیمیا و فسیۆلۆجیا". بوونەوەرە ئەندامیەکان زیاتر ئاڵۆزترن لە بوونەوەر نائەندامیەکان لەڕووی پێکهاتەیانەوە، "ژیانیش" یەکێکە لە دیاردە هەڵقوڵاوەکانی ئەو پێکهاتە ئاڵۆزە. مرۆڤ ئاڵۆزترین بوونەوەرە لەناو بوونەوەراندا، وە لە مرۆڤدا "مێشک" ئاڵۆزترین بەشە کە پێکهاتووە لە پرۆسە فسیۆلۆجیەکان، ئەقڵیش هەڵقوڵاوی ئەو ئاڵۆزیەیە. واتا "ئەقڵ " لە مرۆڤدا ئاڵۆزترین بەشە، پرۆسە ئەقڵیەکانیش ئاڵۆزن، بۆیە پێشبینیکردنی دۆخە ئەقڵیەکان کارێکی ئاسان نیە بە بەراوردکردن بە دۆخەکانی تری جەستە.

ئەمە ئەو چوار تیۆرە بوون سەبارەت بە ئەقڵ، بەڵام هەریەک لەم تیۆرانە ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنە بوونەوە لەناو مێژووی فەلسەفەدا، هەرچەندە ئێمە ناتوانین ئاماژە بەو ڕەخنانە بکەین چونکە ، ڕەخنەکان بابەتێکی جیاوازن و کتێبێکی تایبەتی دەوێت.

## هەڵویستی پزیشکەکان بەرامبەر ئەقڵ

دوای ئاماژەپێکردن بە بۆچوون و هەڵویستی فەیلەسووفان سەبارەت بە ئەقڵ، ئێستا باس لە بۆچوون و هەڵوێستی پزیشکەکان دەکەین، هەرچەندە ئەوان خاوەنی یەک هەڵویست نەبوونە، بەڵکو چەندین هەڵویستی جیاوازیان هەبووە بەرامبەر بە سروشتی ئەقڵ. هەڵوێستەکانیان لە کۆنفرانسی زانستی لە ڤارنای بلغاریا ساڵی ١٩٧٥ خستەڕوو، کورتەی هەڵویستەکانیان ئەمە بوو:

پزیشکەکان بانگەشەی "ئەخلاقی ئەرکێتی"یان دەکرد و مەبەستیان تێگەیشتن بوو لە پێکهاتەی بیۆلۆجی مرۆڤ، ئەمە بە واتای خوێندنەوە دەهات بۆ پێکهاتەکان یان توخمە "فیزیکی و کیمیایەکان" و گرنگی

جینات و گۆاستنەوەی لە باوانەوە بۆ نەوەکان، بۆیە ئەگەر هاتوو ئێمە گەیشتین بە زانینێکی ورد و دروست سەبارەت بەم بابەتە ئەوە خۆمان و کۆمەڵ لە مەترسی نەخۆشیەکان دەپارێزین کە ڕووبەڕوومان دەبوونەوە. ئەم ئاڕاستەیە لە ئەخلاقی پزیشکیدا لەسەر چەند هەڵوێستێک ڕاوەستاوە، کە گوزارشت لە ئەستەمبوون و مەحاڵ لە پێناسەکردنی ژیان و ڕاڤەکردنی تەنها بە یاسا فیزیکی و کیمیاییەکان. هەروەها پزیشکەکان سەبارەت بە تێگەیشتن لە هزری مرۆیی دەپرسن، بەم دوو جۆرە وەڵامە وەڵامدەدەنەوە، ڕەنگە ئەقڵ تەنها بریتیبێت لە چالاکی خانەکانی مێشک، بەڵام دەکرێ بڵێین ئەقڵ تەنها بەهۆی یاساکانی فسیۆلۆجیاوە ڕاڤەنەکرێت. ئەم دوو وەڵامە بۆ کۆنفرانسەکە بە دیدی ڕەخنەییەوە تەماشاکرا. گومان لەوە هەیە زاناکان زانیاری تەواویان لەسەر خانە و توانا و چالاکیەکانی ناو مێشک هەبێت، بۆیە ناکرێ تەنها بەو دوو وەڵامە ڕازی بین.

بە گشتی، دتوانین بڵێین شتێک نیە بە ناوی "ئەقڵی پەتی". تێگەیشتن لە ئەقڵی مرۆیی لە دەرەوەی مەرجەکانی دەرکەوتنی بوونەوەری زیندوو ئاسان نیە، کەواتە لە چوارچێوەی بیۆلۆجیادا دەتوانین لە ئەقڵی مرۆیی تێبگەین.

## تەسکی چوارەم: ئەندازیاری بۆماوەیی - "ویراسی"

بریتییە لە ئاڕاستەیەکی هاوچەرخ کە لە تەکنەلۆجیای زانستی سەردەمەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەم ئاڕاستەیە گرنگی بە لایەنی "بۆماوەیی" مرۆڤەکان دەدات، بەمەبەستی زاڵبوون بە سەر نەخۆشیەکان و کەموکورتیەکان و باشترکردنی کۆرپەلە و چارەسەرکردنی چەندین نەخۆشی کوشندە کە بەڕێگای باوانەوە دەگۆازرێتەوە بۆ نەوەکان. هەروەها گرنگی بە چەندین دیاردەی نوێ دەدات لە ژیانی مرۆڤدا کە بەهۆی تەکنەلۆجیاوە دەرکەوتوون لەوانە "پیتاندنی دەستکرد بۆ ڕزگاربوون لە نەزووکی" و "منداڵی بلوری" و "کوشتنی بە بەزەیی"، ئەمانە و چەندین دیاردەی تر کە گرفتی ئەخلاقی و یاسایی بۆ پزیشکان دروستدەکات، هەر کارێک لەوانە لێکەوتەی یاسایی و ئەخلاقی خۆی هەیە و دەبێتە گرفتێکی ئەخلاقی بۆ ئەخلاقی پزیشکی.

ئەندازیاری بۆماوەیی گوزارشت لە توانای مرۆڤ دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر سروشت و سروشتی مرۆیی، واتا نامەی زاناکان تەنها بۆ تێگەیشتن لە جیهان و مرۆڤ نییە، بەڵکو بۆ گۆڕین و گەشەپێدانی ژیان مرۆڤیشە. لە کۆندا مرۆڤەکان دەکەوتنە ژێر کاریگەری دیاردە سروشتیەکان و ترس و

دڵەڕاوکێیان لەلا دروستدەبووو، هەبوونی مرۆڤ لە دەشتایی و بیابانەکان هۆکارێک بوو تا کارامەیی لە پیشەی شوانکاریدا پەیدا بکەن، زەویە بە پیتەکانی ناوچەکانیان بووە هۆکارێک تا کشتوکاڵ دابهێنن و سود لە چاندنی زەویەکان ببینن. بەڵام دوای جیابوونەوەی زانست لە دەسەڵاتی کڵێسا و گەشەکردنی زانستە ئەزموونیەکان و دەرکەوتنی میتۆدی زانستی لە گەڕان و توێژینەوەکان و گرنگیدان بە هەست و ئەقڵ وەک دوو سەرچاوەی سەرەکی زانین و زانیاری، مرۆڤ لە قۆناغی ملکەچبوون بۆ دەسەڵاتی سروشت چوونە ناو قۆناغی زاڵبوون و کۆنترۆڵکردنی سروشت و بەکارهێنانی بۆ خزمەتکردنی خۆیان. تا قۆناغەکە گەیشتە دەرکەوتنی تەکنەلۆجیای هەندەسەی ویراسی و جێبەجێکردنی لەسەر بوونەوەرە زیندووکان "جیهانی ڕووەک و جیهانی ئاژەڵان و مرۆڤەکان". بە نمونە لە ئێستادا بەهۆی ئەم تەکنەلۆجیاوە دەزانین چۆن پەرە بە کەرتی کشتوکاڵی بدەین و بەرهەمی زیاتر و باشتر دروستبکەین، هەروەها لە سامانی ئاژەڵدا بەهەمان شێوە بە هۆی تەکنەلۆجیاوە دەتوانین باشترین جۆری بەرهەمی ئاژەڵان بەرهەم بهێنین.

ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە و مەبەستمانە تیشک بخەینە سەری "گرنگی هەندەسەی ویراسیە بۆ مرۆڤ". بە تایبەت بە بواری "هەندەسەی جینات"، وەک دەزانین زانستی بیۆلۆجیای هەندەسەی جینات گەیشتووەتە قۆناغێک لە گەشەکردن و زانیاری دەرباری مرۆڤ و پێکهاتە و سروشتی مرۆڤ کە دەکرێ ڕێگری لە زۆر شت بکرێ ڕوبدات و کاریگەری خراپی هەبێت لەسەر ژیانی مرۆڤەکان وەک "زانینی توشبوون بە نەخۆشی کوشندە پێش ئەوەی توشبێت لە ڕێگای پشکنینی تایبەت بە جیناتی کەسەکە. "وەرگێڕ". یەکێک لە خەونە گەورەکانی مرۆڤایەتی هەبوونی کۆمەڵگایەکی تەندروست و بێ نەخۆشی "مرۆڤی ئایندە"، ئەو مرۆڤە کامڵەیە کە هەموو تاکێک خەونی پێوەدەبینێت، بەنمونە مافی هەموو کەسێک کە دێتە دونیاوە کەم ئەندام نەبێت یان هەڵگری نەخۆشێیەکی کوشندە نەبێت یان گرفتی ئەقڵی نەبێت، ئەمە مافی هەموو کەسێکە، لە هەمان کاتدا هەندەسەی جینات کار لەسەر ئەم جۆرە بڕیارانە دەکات و هەوڵدەدات کۆمەڵگایەکی لەو جۆرە لە داهاتوودا دروستبکرێ. "وەرگێڕ".

ئەو پرسیارەی لێرەدا گرنگە و دەکرێت ئەمەیە، ئایا تا چەند خێزانەکان ئامادەن پەنا بۆ هەندەسەی جینات بەرن بۆ بە دیهێنانی خەونەکانیان؟ ئایا توانای ئەوەیان هەیە ڕووبەڕووی ئەخلاق و ئاکاری کۆمەڵایەتی ببنەوە لە کاتێکدا کە پەنادەبنە بەر زانست و هەندەسەی جینات بۆ دەستکاریکردنی داهاتووی کۆرپەلەکانیان؟ لێرەدا هیچ جۆرە ڕێگریەک و لەمپەرێک نیە لە بەردەم دایکان و باوکان کە ببێتە بەربەست بۆ ئەوەی کۆرپەلەکەیان بێ عەیب و بێ کەموکورتی بێتە نێو ژیانەوە، چونکە مافی منداڵانە بە کە ساغی و سەلامەتی بێنە دونیاوە، واتە کەم ئەندام نەبن، گرفتی ئەقڵی و جەستەییان نەبێت، بەشێک لەو گرفتانە بە چارەسەری جیناتی چارەسەردەکرێن، بۆیە مافی منداڵەکانە بەسەر خێزانەکانیانەوە پێش هاتنیان بۆ ناو دونیا لەو گرفتانە پارێزراوبن. بەڵام منداڵ ئەو مافەی نیە بەسەر دایک و باوکەوە بۆئەوەی ڕەنگی چاویان یان پرچیان یان پێستیان بە دڵی ئەوان بێت. هەروەها پزیشکانیش لە ڕووی ئەخلاقیەوە کار بۆ ئەوە دەکەن ڕێگری بکەن لەوەی منداڵەکان بە کەم ئەندامیەوە بێنە دونیاوە.

پەیووەست بەم بابەتانەوە گروپێکی تر هەیە لە دەرەوەی پزیشکان و دایکان و باوکانەوە، گرنگی بە هەندەسەی جینات دەدات ئەویش

"دەوڵەتە". ڕەنگە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا هەبێت وا بیربکاتەوە پێویستی بە نەوەیەک هەبێت لە داهاتوودا دووربن لە بیرکردنەوە و ڕەخنەگرتن، نەوەیەک حەز و ئارەزوویان بۆ فێربوون و زانست و زانین نەبێت. "وەرگێڕ". لە نمونەی ئەو دەوڵەتانە "دەوڵەتە دواکەوتووەکان - گەندەڵەکان - دیکتاتۆرەکان - داگیرکەرەکان"، بە نمونە لە دەوڵەتە دواکەوتووەکان پێویستیان بە نەوەیەکە لە داهاتوودا بیرنەکاتەوە و بەردەوام فەرمانەکانی وەک خۆی جێبەجێبکات بێ ئەوەی ڕەخنە و گازەندەیان هەبێت لەسەر بڕیارەکان، بۆ ئەمە پەنا دەباتە بەر دەستکاریکردنی جیناتیان و بە هێزکردنی جیناتی تایبەت بە "گەمژەیی و لاوازی لە زیرەکی". بەڵام ئەم جۆرە خەونانە دوورە لە کاری پزیشکی و خێزانەکان، ئەوان بەردەوام بیر لەوە دەکەنەوە کۆمەڵگایەکی مرۆیی دروستبکرێت نەک سەربازی، گرنگی بە لایەنە باشەکانی کەسەکان بدرێت و گەشەی پێبکرێت بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی نەک بۆ لەناوبردنی. بە نمونە "کۆمارەکەی پلاتۆن" وەک شارێکی نمونەیی خەڵکی ئامادە دەکرد وەک ئامراز خزمەتی دەوڵەت بکات یان فەرمانڕەواکان.

## تەوەری پێنجەم: وەچەخستنەوەی دەستکرد

لە ئێستادا مرۆڤایەتی لەناو قۆناغی زانست و تەکنەلۆجیادا دەژییەت و چرکە بە چرکە ڕۆژانە بۆ خزمەتکردنی خۆی پەنادەباتە بەر زانست و تەکنەلۆجیا، بە هەمان شێوە پزیشکان و دەوڵەتانیش بۆ کار و پیشە جیاوازەکانیان پەنادەبەنە بەر زانست و تەکنەلۆجیا بۆ چارەسەرکردنی گرفت و دەرچوون لە قەیرانەکان و دەربازبوون لە مەترسیەکان و نەخۆشیەکان. لەگەڵ هەموو لایەنە باشەکانی تەکنەلۆجیا و بەکارهێنانی بۆ خزمەتکردنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، ئێستا قۆناغی ڕەخنە و شیکردنەوە و گفتوگۆکردنە لەسەر چۆن و کەی و بۆچی تەکنەلۆجیای سەردەم بەکاربێت؟ چەندین پرسیاری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و ئایینی دروستبوونە لەبەرامبەر بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای سەردەم بەتایبەت لە بوارەکانی سەربازی و زانستی "پزیشکی" و هەندەسەی جینات و دەستکاریکردنی سیفاتی کۆرپەلە و زیرەکی و چەندین کارامەیی تری مرۆڤەکان. ئەمانە و چەندین پرسی تری گرنگ لەوانە "وەچەخستنەوەی دەستکرد"، ئەمە بە دیاردەیەکی تازە و نوێ دادەندرێت، ڕەنگە لە ڕووی ئەخلاقیەوە چەندین گرفت دروستبکات. بۆیە پزیشکەکان دەڕوانە ئەم

بابەتە وەک ئەوەی گرفتێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و یاسایی بێت زیاتر لەوەی دەستکەوتێکی مەزنی تەکنەلۆجیا بێت. ئەمە "وەچەخستنەوەی دەستکردە"، کە سێ فۆرمی هەیە ئەوانیش "پیتاندنی دەستکرد" و "منداڵی بلوری" و "دایکی بە وەکالەت". بۆ هەریەک لەوانە چەندین گرفتی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و یاسایی هەیە، بەنمونە گرفتە ئەخلاقیەکان و کۆمەڵایەتیەکانی "پیتاندنی دەستکرد" لەوانە هەستکردنی هەریەک لە "پیاوەکە و ژنەکە" بە بوونی پەیوەندیەکی ناتەندروست لەگەڵ منداڵەکە وەک نەبوونی خوشەویستی و سۆز، لە ڕاستیدا لە پیتاندنی دەستکرد "ژنەکە" وا هەستدەکات لەیەک کاتدا هەم دایکە و هەم باوکە، چونکە باوکەکە هیچ ڕۆڵی نەبووە لە دروستبوونی منداڵەکە و لە دایکبوونیدا، واتا باوکەکە سیفەتی "باوکێتی" نیە بۆ منداڵەکە، منداڵەکەش کاتێک گەورە دەبێت مافی ئەوەی هەیە "باوکێتی" باوکی ڕەتکاتەوە و بە دوای "باوکی" ڕاستەقینەی خۆید بگەڕێت. ئەمانە بۆ خۆی گرفتی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقین. لە لایەکی ترەوە خودی منداڵەکە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پیاوەکە توانای ئەوەی نیە وەچە بخاتەوە، ئەمەش بۆخۆی گرفتی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە و ڕەنگە ببێتە هۆی داڕمانی کەسەکە لە ڕووی

دەروونیەوە. جگە لە گرفتەکانی وەک دابەشکردنی سەروەت و سامان دوای مردنی باوکەکە. بۆیە دەبینین زۆر بە وریاییەوە ئەم جۆرە کارانە ئەنجامدەدرێن. هەروەها "دایکی بە وەکالەت" بە هەمان شێوە گرفتی لێدەکەوێتەوە، بەتایبەت گرفتی "دایکایەتی" "دایکی ڕاستەقینە"، ڕاستە لەم جۆرە تەکنەلۆجیایەدا گرفت لەسەر "باوکی ڕاستەقینە" نیە، بەڵکو گرفتەکە بۆ "دایکەکە" دروستدەبێ هەرچەندە "دایکەکە" "هێلکەی خۆی" بە "ئاوی" پیاوەکەی خۆی داوە بەڵام هێشتا ئەو "دایکی" ڕاستەقینەی منداڵەکە نیە، "دایکی" ڕاستەقینەی منداڵەکە ئەو ژنەیە کە "هێلکەکەیان" لەناو "رەحمی" داناوە و ئازار و مەینەتی بوونی کۆرپەلەی هەڵگرتووە.

فەیلەسووفان و پزیشکان دەڕوانە ڕەگ و ڕیشەی ئەم بابەتە و دەپرسن: "بۆچی لە بنەڕەتدا گرنگی بە وەچەخستنەوەی دەستکرد دەدرێت؟ وەڵامە ڕوون و ئاشکراکە ئەوەیە "ئەو ژن و مێردەی" حەزیان بە منداڵە و توانای ئەوەیان نیە منداڵ بخەنەوە، ئەوە پەنا دەبنە بەر وەچەخستنەوەی دەستکرد، بۆ ئەم کارە پاڵنەری خۆی هەیە لەوانە "تێرکردنی خواستی باوکایەتی و دایکایەتی" و "هاوکاریکردنی دایک و باوک لە پیریدا" و "ڕزگارکردنی خێزان لە هەڵوەشانەوە" و "هێنانی خۆشی و بەختەوەری بۆ خێزان" و

"خێزانێک منداڵیان هەبێت لەناو کۆمەڵگا زیاتر ڕێز لێگیراوە". ڕەنگە ئەم پرسیارە بکرێت "ئایا هەموو خواستێکی مرۆڤ شیاوی بەدیهێنانە؟" لە وەڵامدا دەوترێت "نەخێر"، بە نمونە "ئەوانەی خواستی سزادانی ئەوانیتریان هەیە، شیاوە خواستەکەی بەدیبێت؟ هەروەها زۆرێک لەو خێزانانەی لە منداڵ بێ بەشن هیچ گرفتیان نیە و بە خۆشی و بەختەوەری ژیانی خۆیان دەکەن. لێرەوە هەندێکیان دەگەنە ئەو ڕایەی وەچەخستنەوەی دەستکرد بۆ تێرکردنی خواست لە ڕووی ئەخلاقیەوە کارێکی نەشیاوە، چونکە تەنها بوونی خواست مەرج نیە تێربکرێ، یان تێرکردنی مەرجێکی ناچاری نیە.

بۆیە گەورە پزیشکان و فەلسەفەکارانیان بە دیدێکی ڕەخنەگرانە دەڕواننە بابەتی "وەچەخستنەوەی دەستکرد" و دەپرسن "ئایای وەچەخستنەوەی دەستکرد مافێکە هەموو ژن و مێردیک دەتوانن داوای بکەن؟". ئێمە سەرەتا پێویستە ئەو هۆکارانە بزانین کە دەبنە هۆی وەچەنەخستنەوە. ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە بە هۆی نەخۆشیەوە بێت لە یەکێک لە ئەندامەکانی زاوزێ. ئەوکات بە شێوازی نەشتەرگەری پزیشکی دەتوانرێت چارەسەربکرێت، بەم جۆرە کۆتایی بە

گرفتەکە دەهێنین، واتا دەستنیشانکردنی هۆکار باشترین هەنگاوە پێش ئەوەی ئێمە باس لە ڕەوایەتی یان ناڕەوایەتی وەچەخستنەوەی دەستکرد بکەین. "وەرگێڕ". ڕاستە هەستکردنی بە نەزۆکی یان نەبوونی توانای وەچەخستنەوە دەبێتە هۆی نیەگەران و دڵتەنگی کەسەکە، بەڵام نەخۆشی نیە، ناکرێ وەک نەخۆشی تەماشا بکرێت. چونکە "بێ توانایی لە وەچەخستنەوە" نابێتە هۆکارێک لە بەردەم کەسەکە بۆئەوەی لە ژیانیدا سەرکەوتوونەبێت، واتا نەخۆشیێک نیە ببێتە ئاستەنگ لەبەردەم ژیان. بۆیە "وەچەخستنەوەی دەستکرد مافێک نیە کەسی بێ توانا لە وەچەخستنەوە داوای بکات"، ئەگەر نەخۆشی بووایە ئەوکات دەبووە مافێک کە هەموو ئەوانەی توانای وەچەخستنەوەیان نەبوو داوای بکەن. بەڵی وەچەنەخستنەوە گرفتە، بەڵام نابێت ئێمە وا بیربکەینەوە کە دەبێت هەموو گرفتەکانی خەڵکی چارەسەربکەین.

## تەسکی شەشەم: مراندن بە پاساوی بەزەیی "مراندنی بە بەزەییانە"

دیاردەی مراندنی بە بەزەییانە وەک گرفتێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و ئایینی ڕووبەڕووی ڕەخنە و دژایەتیکردنی زۆر بۆتەوە، پەنابردنە بەر مراندنی بە بەزەییانە بۆ ئەو نەخۆشانە بووە کە بێ هیوا بوونە لە چارەسەرکردنیان و بۆئەوەی ڕزگاربکرێن لە ئازارە سەختەکانی نەخۆشیەکە، بۆیە پزیشکان بڕیاردەدەن بە "مراندنی" نەخۆشەکە، بەڵام "مراندنی" لەژێر هەر پاساو و پاڵنەرێک بێت لە دواجاردا جۆرێکە لە "کوشتنی بە ئەنقەست" یان "کوشتنی بە مەبەست"، ئەمەش تاوانە و لێخۆشبوونی بۆ نیە. بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە لەوەی زانستی پزیشکی پێشکەوتنی زۆری بینیوە لەپێناو خزمەتکردن بە نەخۆش و چارەسەرکردن و چاکبوونەوەیان، بەڵام ئێمە ناتوانین بە هەمان شێوە پێشکەوتن لە بواری گرفتە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکان تۆماربکەین، بە تایبەت بۆ ئەو نەخۆشانەی بێ هیوا بوونە لە چاکبوونەوە؟ واتا سەیرە تا ئێستا نەمانتوانیوە گۆرانکاری لە شێوازی بیرکردنەوەماندا بکەین بەرامبەر بەو هەموو

پێشکەوتن و پەرەسەندنانەی زانست و تەکنەلۆجیای پزیشکی تەنانەت ئەگەر بۆ ئاسودەیی و بەختەوەری و ئارامی خۆمانیش بێت. "وەرگێڕ".

لە ڕاستیدا ئەم گرفتە دوو لایەنی هەیە، ئەوانیش "لایەنێک بۆ نەخۆش و پزیشک یان ئەخلاقیاتی پزیشکی کە گرنگە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان. لایەنی دووەمی گرفتەکە بۆ زانایانی ئەخلاق گرنگە. ئەوەی تایبەتە بە "پزیشکە" وەک چارەسەرکەری نەخۆش. لێرەدا دەپرسین: "ئایا ئەرکی پزیشکە ڕاستگۆبێت لەگەڵ نەخۆشەکەی و جۆری نەخۆشیەکەی پێ بڵێت؟ ئایا نەخۆش ئەو مافەی هەیە ڕاستی بارو دۆخەکەی پێ بووترێت؟ یان پێویستە ئێمە وەک بەزەیی پێداهاتنەوە بە نەخۆشەکە ڕاستیەکانی لێ بشارینەوە؟

لێرەدا زاناکانی ئەخلاقناسی دەڵێن: "شاردنەوەی ڕاستیەکان لە نەخۆشەکان جۆرێکە لە درۆکردن و خەڵەتاندن، ئەمە لە ڕووی ئەخلاقیەوە ڕەتکراوەتەوە و پەسەند نیە". واتا پێویستە و ئەرکە ڕاستیەکانی پێ بووترێت. سەبارەت بەم بابەتە لەناو پزیشکاندا کۆدەنگی هەیە لەسەر "مراندنی بە بەزەییانە" بە پاساو و پاڵنەری کەمکردنەوەی ئازارەکانی ئەو نەخۆشانەی بێ هیوا بوونە لە چاکبوونەوە، بەنمونە ئەو کەسانەی دەکەونە

دۆخی "بێهۆشی" تەواو، ئەو کەسانەی ئازاری زۆریان هەیە بە دەست نەخۆشیەکی کوشندەوە، ئەو منداڵەی ناتەواو و کەم ئەندامە و هیوای چاکبوونەوەی نیە، ئەو منداڵەی لە دایک دەبێت، بەڵام بێ لاق و دەست و بینین و بیستنە، ئەمانە و چەندین حاڵەتی تر هەن کە پێویستە بڕیاری مراندنیان بۆ دەربچێت. دیسانەوە ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبینەوە "ئایا نەخۆش مافی ئەوەی هەیە زانیاری لەسەر نەخۆشیەکەی بزانێت؟ واتا ئاساییە ڕاستی نەخۆشیەکەی پێ بووترێت؟ پزیشکان لەم بابەتە دوودڵن، بە هۆی هەبوونی جیاوازی لە وەڵامدانەوەی نەخۆشەکان سەبارەت بە باری تەندروستیان. ڕەنگە بەشێک لە نەخۆشەکان بە لایانەوە ئاسایی بێت کاتێک ڕاستی نەخۆشیەکەیان دەزانن و ئازایانە لە دۆخەکە تێدەگەن، بەڵام بەشێکی تریان بە پیچەوانەوە توشی سەرسوڕمان و تێکچوونی دەروونی و هەستکردن بە تەنیایی و تاریکی دەکەن بە بیستنی هەواڵەکە، بۆیە لەم حاڵەتانەدا ڕەنگە نەخۆشەکە دوژمنانە ڕەفتار بکات. بەهەر حاڵ پزیشکان کۆکن لەسەر ئەوەی ڕاستیەکان بە نەخۆشەکان بووترێت، بەڵام لەهەمان کاتدا کۆکن لەسەر ئەوەی بە شێوەی ڕاستەوخۆ و خێرا و لەناکاو ڕاستیەکانیان پێ نەوترێت، بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو و لەسەرخۆ

ڕاستیەکانیان بۆ ئاشکرا بکرێت و هاوکاریان بکرێت لە وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێک کە نەخۆشەکە دەیکات، پێویستە نەرم و نیان و بەسۆزبن لەگەڵیاندا، تا دەگەنە قۆناغی ئارامی و هێمنی هەتاهەتایی. بەڵام سەبارەت بە بڕیاری مراندنی نەخۆشەکە هەموو پزیشکان کۆکن لەسەر ئەوەی پێویستە بە ڕەزامەندی و ڕازیبوونی نەخۆشەکە ئەو کارە بکرێت، چونکە "ژیان لای خاوەنەکەی پیرۆزە"، هەروەها ژیانی مرۆڤەکان کاڵایەک نیە پزیشکان بە ئارەزووی خۆیان مامەڵەی پێوە بکەن. ڕەنگە ئەم کارە بۆ نەخۆشەکە ئاسان نەبێت، نەخۆشەکە نەتوانێت بڕیارەکە پەسەند بکات، بۆیە پەنا دەبرێتەبەر کەس و کارەکەی و کەسە نزیکەکانی و سەبارەت بە بڕیاری "مراندنەکەی" قسەیان لەگەڵ دەکرێت بۆئەوەی ڕەزامەندیان وەربگیرێت و ئەو کارە ئەنجامبدرێت و کۆتایی بە ژیانی نەخۆشەکە بهێنرێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا ڕەنگە ڕای جیاواز هەبێت لەناو کەس وکارەکەی، بۆیە پزیشکان پەنا دەبەنە بەر تیمی چارەسەرکەر و بڕیاردان لەسەر بابەتەکە. ئەمە سەبارەت بە لایەنی پزیشکان و نەخۆشەکە.

لایەنی دووەم کە تایبەتە بە زاناکانی ئەخلاقەوە، ئەوان پرسیاری ئەوە دەکەن "ئەگەر ئێمە بەوە ڕازی بین و مراندنی نەخۆشەکە بە پاساوی

بەزەیی و ڕەحم کردن بە نەخۆشەکە و بەکارێکی مەشروع و ڕێگەپێدراومان زانی، ئەوە دەکەوینە ناو گێژاوی سەرسوڕمانەوە سەبارەت بە دۆخی هاوشێوە. چونکە ئێمە ئەگەر بەوە ڕازی بین ئەوە ناتوانین بەرامبەر بە حاڵەتی هاوشێوە و لێکچوو بێدەنگ بین. بەنمونە ئایا دەتوانین ڕێگە بەوە بدەین کەسێک لەژێر پاساوی بە بەزەییانە بمرێنرێت، لەبەرئەوەی ئازار و ناڕەحەتی زۆری هەیە. وەک ئەوانەی لە تەمەندا گەورەن یان ئەوانەی بە کەم ئەندامی لەدایک دەبن یان ئەوانەی ئۆتیزمیان هەیە...هتد. بۆیە ڕازیبوون بە بڕیاری لەم جۆرە گرفتی ئەخلاقی زۆری تێدایە، هیچ متمانە و یاسایەک نیە ئەوکات ڕێگری لە دەسەڵات بکات لەوەی ناحەزان و پارتەکانی ئۆپۆزسیۆن لەناو نەبرێن بە دروستکردنی کەیسی جوارجۆر. بەنمونە ئەوەی "هیتلەر" لە ئەلمانیا لەساڵی ١٩٣٩ بەرامبەر بە کوشتنی ٢٧٥٠٠٠ کەس کردی بە پاساوی "نەخۆشی ئەقڵی و بەساڵاچوان" و ئەمانە بوونەتە بارگرانی بەسەر بوودجەی دەوڵەتەوە. بۆیە زاناکانی ئەخلاق لەگەڵ مراندنی نەخۆشە بێ هیواکان لە چاکبوونەوە گرفتیان نیە، بەو مەرجەی ئەم بابەتە لەوە زیاتر فراوان نەکرێت و پاساوی بێ کۆتایی بۆ کوشتنیان دانەنرێت.

# لیستی سەرچاوەکان

## سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:

١- ابن خلدون، المقدمة، الطبعة البهية القاهرة.
٢- ابن سينا، القانون في الطب، مكتبة المثنى بغداد.
٣- ابن قيم الجوزية، الطب النبووي، مكتبة الرياض.
٤- ابن النفيس، شرح فصول ابقراط، الدار المصرية، ١٩٩٠.
٥- هنري برجسون، المدخل الى الميتافيزيقا، ملحق بكتاب الفلسفة و مباحثها، دار المعارف الاسكندرية.
٦- برنارد كلود، المدخل الى الطب التجريبي، ترجمة، يوسف مراد، وزارة المعارف، ١٩٤٤.
٧- حسن كمال، الطب المصري القديم، المؤسسة المصرية للتاليف و الترجمة، ١٩٦٤.
٨- الذهبي، الطب النبووي، مكتبة القران.
٩- فخرالدين الرازي، كتاب الفراسة، تحقيق، يوسف مراد.
١٠- جوديت راندل، كل شي عن الوراثة، ترجمة، حسين فهمي، دار المعارف، ١٩٧٦.

١١- فؤاد زكريا، التفكير العلمي، عالم المعرفة، الكويت.

١٢- زكي نجيب محمود، جابر بن حيان، سلسلة اعلام العرب.

١٣- محمود فهمي زيدان، مناهج البحث الفلسفي.

١٤- يوسف زيدان، رسالة الاعضاء مع دراسة حول ابن النفيس، الدار المصرية اللبنانية، ١٩٩٠.

١٥- جۆرج سارتون، تاريخ العلم، ترجمة، محمد بدران، دار لمعارف .

١٦- حبيب الشاروني، فلسفة بين دي بيران، دار النشر المغربية.

١٧- توفيق الطويل، في تراثنا العربي الاسلامي، عالم المعرفة.

١٨- عثمان امين، الفلسفة الرواقية، دار احياء الكتب العربية، ١٩٤٥ .

١٩- بوول غليونجي، الحضارة الطبية في مصر القديمة، دار لامعارف، ١٩٦٥

٢٠- بوول غليونجي، ابن النفيس اهلام العرب.

٢١- الكسيس كارليل، الانسان ذلك المجهول، ترجمة، عادل شفيق، ١٩٦٤

٢٢- ماهر عبدالقادر محمد، دراسات و شخصيات في تاريخ الطب العربي.

٢٣- علي سامي النشار، مناهج البحث عند مفكري الاسلام، دار لامعارف، ١٩٦٧.

سەرچاوەکان بە زمانی ئینگلیزی:

1- Braine, (David), Lesser (Harry) :Ethics, Technology and Medicine.

2-Gert (B) Culver(C.M)Philosophy in Medicine.

3-Harris (J.R):The legecay of Eygbt.

4-Lamb (David), Davies (Teifion)and Robers (Marie): Exploration in Medicine .

5- Rides (Bruno):Biology and Ethics (Reflections inspired by a Unesco symposium, published by the Unesco 1978.

6-Soubrian (Andre) :Avicenne , parince des medecins, 1936paris.

7-Worsly; Everyones guide to acupuncture.

a- Dictionary of Asian philosophers by st. Elmo Nauman.

b- Ency, of philosophy; Items. Vitalism, organism, biology, mechanism, monism, wholism.



## حەسەن حوسێن سدیق موحەممەد جەباری

**نازناوی زانستی: پرۆفیسۆر**

- بەکالۆریۆس لە فەلسەفە - زانکۆی المستنصریة 2000
- ماستەر لە فەلسەفەی زانست - زانکۆی بەغداد 2003
- دکتۆرا لە لۆژیک و فەلسەفەی زانستەکان - زانکۆی المستنصریة 2010

**مامۆستای «لۆژیک و فەلسەفەی زانستەکان» لە زانکۆی ڕاپەڕین**

## نووسینی زانستی بە زمانی عەرەبی:

- دور الميتافيزيقا في بناء العلم و النظرية العلمية، دار نينوى-سوريا
- دراسات في المنطق و فلسفة العلوم. دار نينوى-سوريا
- "منطق التطور العلمي عند توماس كون" -دار نينوى-سوريا
- الانسان و مشكلاته الاجتماعية و السياسية المعاصرة. سوريا.

## نووسینی زانستی بە زمانی کوردی:

1- لۆژیکی فۆرماڵ و لۆژیکی بیرکاری.
2- فەلسەفەی زانست.
3- پەیوەندی نێوان فیزیا و فەلسەفە.
4- فێرکردنی بیرکردنەوە.
5- فەلسەفەی پزیشکی.
6- تیۆری زانین.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (194) ساڵی (2022) پێدراوە




زانکۆی ڕاپەڕین
2022

ISBN 978-9922-9583-0-9

